# خانەقین

## لە بەڵگەنامەکانی عوسمانیدا

١٢٦٩- ١٣٣٦ کۆچی

١٨٥٢- ١٩١٨ زایینی



**بەرگی حەڤدە**




بڵاوکراوەی زانکۆی جیهان

خانەی ئەرشیف و بەڵگەنامەکان

٢٠٢٥

ئامادە و پێشکەشکردنی: **د. نەوزاد یەحیا باجگر**

وەرگێڕان: **ئاشتی رەحمان**

# پێرست




- ناوی کتێب • **خانەقین** لە بەڵگەنامەکانی عوسمانیدا

بەرگی حەڤدە ١٢٦٩-١٣٣٦ کۆچی/ ١٨٥٢-١٩١٨ زایینی

- ئامادە و پێشکەشکردنی • د. نەوزاد یەحیا سەعید باجگر
- وەرگێڕان (زمانی عوسمانی) • ئاشتی ڕەحمان
- دیزاینی ناوەڕۆک • سومەییە مورادی
- بڵاوکراوەی • زانکۆی جیهان | خانەی ئەرشیف و بەڵگەنامەکان
- تیراژ • ١٠٠٠ دانە
- چاپ • یەکەم ٢٠٢٥ هەولێر

ISBN: 978-9922-8978-2-0





لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارەی سپاردن (      )ی ساڵی ٢٠٢٥ی وەزارەتی ڕۆشنبیری

ئەم وشە و بیروبۆچوونانەی کە لەم پەرتوکەدا نووسراوەتەوە سەرچاوەکەی بەڵگەکانە و ئێمە لێی بەرپرس نین، لەبەر ئەمانەتی زانستیش لەکاتی وەرگێڕانی دەستکاری نەکراوە.

# پێشەکی

خانەقین لە سەردەمی عوسمانیەکاندا لە رووی دابەشکاری کارگێری قەزا بووە سەر بە ویلایەتی بەغداد؛ لە باکوور ویلایەتی موسڵ، رۆژهەڵات دەوڵەتی ئێران، باشوور مەندەلی و رۆژئاوای قەزایەکانی خۆراسان دەورە درابوو، دانیشتوانی قەزاکە بەشە زۆرەکەی لە عەشائیری کورد پێك دەهاتن و بەشێکیشی تورك و عەجەم و عەرەب بوون، زمانی گشتی زمانی تورکی بووە، بە پلەی دووەم زمانی کوردی بووە و عەشیرەتەکانی بەنی وەیس و رەبیعە بە زمانی عەرەبی و لە ناو هەندێك عەشیرەتەکانیش بە زمانی فارسی قسە کراوە.

بینایەکانی شارۆچکەی خانەقین رێك و بە باغ و باخچە دەورە درا بوو، لە شارۆچکەکە ٣ جامیع و ٣ مەسجید و ١ مەکتەبی سەرەتایی و ٣ مەکتەبی سبیان و ١٣ خان، ٦ علوە و ١ میوانخانە و ١٠ قاوەخانە و ٧ گەرماو بوونی هەبووە. هەروەها لە رووی سەربازییەوە مەرکەزی ئاڵای سوارەی ٣٤ و تابوری چوارەمی ئاڵای ٨٢ی رەدیف بووە. هەرچی دامودەزگاکانی حکوومەت لە قۆناغی حکوومەت و قشلەی سەربازی سوارەی نیزامیە و نەخۆشخانەی سەربازی و قشلەی زەبتیە و تەلەگرافخانە لە ناحیەی حاجی قەرە بووە، هەروەها بە دووری ٢٠ خولەك لە حاجی قەرە کەرانتینەخانە هەبووە، جگە لەمە بازاری سەرەکی لە حاجی قەرە بووە و ١٥٠ دوکانی تێدا بووە،

لە رووی کشتوکاڵەوە رووباری ئەلوەند لە باشووری رۆژئاوای خانەقین، کارئاسانی کرد بۆ زیادکردنی بەرووبوومی کشتوکاڵ، کە زەوی و زاری ئەم قەزایە بە رووباری ئەلوەند و دیالە ئاو دەدرا و بەرووبوومی کشتوکاڵی گەنم، جۆ، برنج و خورما بووە. جگە لەمە جۆرەها میوە بەرهەم هێنراوە، لە رووی کانزاییەوەش دەوڵەمەند بووە بە نەوت و دوای کەرکووك بە پلەی دووەم دێت.

قەزای خانەقین بە پلەی یەك شوێنی تێپەربوونی گەشتیارانی ئێران و بازرگانی کردن بووە، بۆیە ئەو بەڵگەنامانەی بەرچاو کەوتووە زۆربەی زانیاری و هەواڵی سەر سنوورە کە پەیوەستە بە پەیوەندی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی لە سەر گەشتیارانی ئێران کە بۆ نەجەف و کەربەلا هاتوون، بە رێگەی خانەقینەوە هاتوون، بەمەش کەرەنتینە لە سنووری خانەقین هەبووە لە کاتی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی گەشتیاران کەرەنتینە کراون، هەروەها خاڵی هاوەردە و هەناردەی کەلوپەلی بازرگانی و تێپەربوونی بازرگانان بووە، بەمەش کێشە و گرفتی گەشتیاران و بازرگانان لەسەر باج و کەرەنتینە و کەلوپەلی قەدەغەکراوی وەکو بڵاوکراوەی ئێرانی و چەك دروست بووە، ئەو بەڵگانەی کە لەم بەرگەدا چاپکراون، نزیکەی ٣٠٠ بەڵگەن، بۆ توێژەران بەڵگەنامەی گرنگ و پر بایەخداری مێژوویین، بۆ بابەتە مێژووییەکان دەبێتە بریاری یەکلاییکەرەوە و کەلێن و بۆشاییەکان پر دەکەنەوە.

د. نەوزاد یەحیا باجگر
سەرۆکی دەستەی ئەمینداریەتی کەمپەکانی زانکۆی جیهان

# چەند روونکردنەوەیەك لە بارەی بەڵگەکان



١
• لە بەڵگەکاندا هەڵەی ساڵ، مانگ و ڕۆژ کراوە؛ لە بارەی مێژووی ناو بەڵگەکان ئەوا مێژووی کۆچی و رومی بەکارهاتووە، لە هەندێک بەڵگەشدا مێژووی رومی یا کۆچیەکەی نووسراوەتەوە، بە تایبەتی لە ساڵە رومیەکە هەڵەی تێدا کراوە.



٢
• هەڵەی ناوی تێدایە، بۆ نموونە ناوی کەسێتی، شوێن و عەشیرەت بە هەڵە نووسراوەتەوە، ئەم نووسەرەی نووسراوەکەی نووسیوەتەوە کوردییەکەی باش نەبووە، بە شێوازی سەر زاری خۆی ووشەکەی نووسیوەتەوە، یاخود لە بارەی ناوچە و شوێنەکانەوە شارەزاییەکی ئەوە تۆی نەبووە، زانیاری لە شێوەزاری ناوچەکەش نەبووە، بۆیە بە هەڵە نووسیویەتیەوە، لە کاتی وەرگێرانیش هەروەکو خۆی نووسراوەتەوە، دەستکاری نەکراوە.



٣
• لە بارەی وەرگێرانی بەڵگەکان، هەروەکو خۆی وەرگێردراوە؛ یەک ووشە زیاد یاخود یەک ووشە کەمی نەکردووە، تەنانەت هەوڵ دراوە لە کاتی وەرگێرانەکە دەستکاری دەستەواژە و ووشەکان نەکرێت، چونکە ئەگەر بە گوێرەی زمانەوانی کوردی دەستکاری دەستەواژە و ووشەکان بکرابووایە، ئەوا دەبووایە دەستکارییەکی زۆری دەستەواژەکان بکرێت، هۆکاری دەستکاری نەکردنەکەش بۆ ئەوە بووە تا بەڵگەکان ڕەسەنایەتی خۆیان لە دەست نەدەن، لە هەمان کاتدا خوێنەر و مێژوونووسان لە شێوازی نووسینی بەڵگە و شێوەزاری ئەم سەردەمەی نووسەران ئاشنا بن، کە ئەم بەڵگانە بە چ شێوازێک نووسراونەتەوە، جگە لەمەش کاری نووسەر و مێژوونووسانە لە کاتی لێکۆڵینەوە لە زانیاری ناو بەڵگەکان، روون کردنەوە و شی کردنەوە بۆ بابەتی ناو بەڵگەکەکان بکەن.



٤
• لە هەندێک بەڵگەدا بۆشایی هەیە، ئەوانیش بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن؛ هۆکاری ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی لە کاتی نووسینەوەی نووسراوەکە هەندێک ووشەی نهێنی هەبووە، نەویستراوە ئاشکرا بێت، بۆیە نووسەرەکە بۆشایی بەجێ هێشتووە، تەنیا ئەوەی نووسراوەکەی گەیشتۆتە دەستی لەم بۆشاییە تێگەیشتووە و زانیویەتی نووسەر یاخود لایەنی پەیوەندیدار مەبەستی چییە.



٥
• لە چەند شوێنێکی کەمیش بۆشایی بە خاڵ هەیە (...) مەبەستیش لەم بۆشاییە بە خاڵانە ئەوەیە، کە ئەم ووشەیە نەخوێندراوەتەوە، زۆر جار ووشە هەیە خوێندنەوەی زۆر ئەستەمە، کە نووسەرەکە بە شێوەیەک یاخود بە خەتێک نووسیویەتی ناتوانرێ بخوێندرێتەوە، بۆ ئەوەی لە خوێندنەوەی هەڵە و لە ووشەی هەڵە دوورەپەرێز بین، بۆ ووشەکە بۆشایی بە خاڵ دانراوە.



٦
• هەندێک ووشە یاخود راستترە بڵێین زاراوە هەیە لەم سەردەمە بەکار هاتووە و مانای تایبەتی خۆی هەیە؛ ئەم مانایە نادەن کە ئێمە ڕۆژانە بەکاری دەهێنین و لێی تێدەگەین، جگە لەمەش وەرگێرانی ئەم ووشانە بۆ کوردییەکەی لە نرخ و ماناکەی تێک دەدات و لە هەمان ئەم ئاستە نابێت، واتە مانای پر بە پێستی خۆی لە دەست دەدات، بۆیە نەکراوەتە کوردی و هەروەکو خۆی دانراوە، بەڵام بۆ ئەوەی خوێنەر و مێژوونووسان لە پێناسەی زاراوەکان ئاشنا بن، لە (شیکردنەوەی زاراوەکانی عوسمانی) پێناسە کراوە و روون کراوەتەوە، لە هەمان کاتیشدا زاراوە هەیە، کە زانراوە لە ماناکەی ناگۆردێت، وەرگێردراوەتە سەر زمانی کوردی.

٧ • بەڵگە هەیە لە چەندین لاپەڕە پێک هاتووە، ئەم چەند لاپەڕەیەش باسی یەک بابەتی دیاری کراو دەکات، بۆیە تەنیا یەک لاپەڕە وەرگێردراوە، چونکە هەموو لاپەڕەکان هەمان بابەت باس دەکەن، جیاوازیەکی ئەوەتۆیان تێدا نییە، بەڵام ئەگەر ئەم چەند لاپەڕەیە باسی چەند بابەتێکیان کردبێت، یاخود هەر هەمان بابەت بەڵام بە شێوازی جیاواز و هەر لاپەرەیەک بە شێوازێکی جیاواز باسی بابەتەکەی کردبێت، لێرەدا مووی وەرگێردراوە.



٨ • دووبارە بوونەوەی بەڵگە، هەندێک بابەتی دیاریکراو دووبارە بوونەوەی بەڵگەی تێدایە؛ وەکو ئەوەی لە سەرەوە باسمان کرد، بابەتەکە لە چەند لاپەڕەیەک پێک هاتووە، لە جیاتی ئەوەی هەمووی کۆبکرێتەوە و هەمان ژمارەی بدرێتی، کەچی بە پێچەوانەوە هەمان بابەت ژمارەی جیاجیایان دراوەتێ، لێرەدا بە ناچاری هەمان بابەت کە لە ژمارەی جیاجیا پێک هاتووە، وەرگێردراوە، چونکە ژمارەیان جیایە و هەمان ژمارەی نەدراوەتێ.



٩ • لە کاتی نووسینەوەی ڕووداوەکان و زانیاری لە بارەی ناوچەکانەوە، بە گشتی باسی بابەتەکان کراوە، بۆ نموونە شوێنی عەرەب نشینیش باسکراوە؛ لێرەدا تەنیا ئەوەی پەیوەندی بە کورد و ناوچەکانی کوردییەوە هەیە وەرگێردراوە.



١٠ • لە نێو بەڵگەکاندا دەستەواژەی دووبارە و ڕستەی دووبارە بەرچاو دەکەوێت، لێرە دا نووسەر لە کاتی نووسینەوەی نووسراوەکەدا هەمان زانیاری یاخود دەستەواژەی دووبـارە کردۆتەوە و هەمان زانیاری نووسیوەتەوە.



١١ • لە بارەی ساڵی بەڵگەکان، بۆ ڕیزبەندی بەڵگەکان ساڵی کۆچی و زایینی بەکار هاتووە، پشت بە مانگ و ڕۆژەکەی نەبەستراوە؛ جگە لەمانەش ساڵی ناو بەڵگەکان بە گوێرەی زانیاری ناو بەڵگەکە و ئەوەی سەر بەرگەکەی گۆرانکاری بەسەر دادێت، واتە نووسەر ئەم ساڵەی نووسیوەتەوە کە بەڵگەکەی تێدا نووسیوەتەوە، کە گەیشتۆتە لای پاشاش ئەم ساڵەی نووسیوەتەوە، کە نووسراوەکەی بینیوە، هەندێک جاریش ساڵی جێبەجێ کردنەکەی لەسەر نووسراوە، واتە لە یەک بەڵگەدا چەند ساڵێکی جیاواز بەرچاو دەکەوێت.



١٢ • هەندێك ساڵ کە لە ناو بەڵگەکاندا ئاماژەی پێکراوە، بە کورتکراوی نووسراوەتەوە، بۆ نموونە دەڵێت ساڵی (٢٧) لێرەدا مەبەستی ساڵی (١٢٢٧)ە، کە ١٢٠٠ ەکەی فڕێ داوە، یا ئەگەر نووسرابێت ساڵی (٣٣٦) ئەوا لێرە مەبەستی ساڵی (١٣٣٦)ە، کە ١٠٠٠ ەکەی فڕێ داوە.

وەرگێـر

# شیکردنەوەی زاراوەکانی عوسمانی

| | |
|---|---|
| **ئالای (الای)** | ئالای بە مانای کۆمەڵ و قەڵەباڵغ دێت، لە زاراوەی سەربازیش ووشەیەکە، لە سێ چوار تابور پێک دێت، هەروەها هەر ئالایەک سانجەقێکی لە ژێر دەستدایە. |
| **ئەعیان (اعیان)** | بۆ بەدواداچوونی بڕیارەکانی ئەنجوومەنی میللەت، ئەنجوومەنێکی تر هەبووە و ئەم ئەرکەیان پێ سپێردراوە، لە ساڵانی ١٨٧٧ و ١٩٠٨ ئەندامەکانی لەلایەن حکوومەتەوە هەڵبژێردراوە. |
| **ئەنبار** | شوێنێکە بۆ هەڵگرتنی زەخیرە و کەلوپەل بەکارهاتووە. |
| **ئەنجوومەنی والا (مجلسی والا)** | ئەم ئەنجوومەنە لە ساڵی ١٨٣٧ دامەزرا، داواکاری نێوان دەوڵەت و خەڵکی جێبەجێ دەکرد، لە ساڵی ١٨٦٧ هەڵوەشایەوە و لە شوێن ئەو شورای دەوڵەت دامەزرا. |
| **ئستەبڵی عامیرە (اصطبل عامرە)** | تەوێلەی کۆشکی پاشا. |
| **ئۆچاقلق (اوجاقلق)** | ئەم زەوییانە جیاکرابوونەوە و داهاتەکانیان بۆ پارێزگارانی قەڵا و کۆگای چەک بوو. |
| **ئۆن باشی (اونباشی)** | ئەم سەربازە قوماندانیەتی ١٠ کەسی کردووە. |
| **ئیستدعانامە (استدعانامە)** | ئەم نووسراوەیە وەکو داواکاری بۆ دەوڵەت دەنووسرێت، بەڵام مۆر و پولی لەسەرە . |
| **ئیستعلامنامە (استعلامنامە)** | ئیستعلام نووسراوی بە زانیاری بووە، هەرچی ئیستعلامنامەیە نووسراوی بە بەڵگە بووە. |
| **ئیستیناف (استیناف)** | دووبارە دەست پێکردنەوە، ئەم بڕیارەی کە لە دادگای سەرەتایی دەدرا، بۆ ئەوەی بڕیارەکە هەڵبوەشێنرێتەوە سەردانی دادگایەکی سەرووتر، واتە لە ئەم بەرزتر دەکرا، تا بڕیارەکە هەڵبوەشێننەوە. |
| **بابی عالی** | بنکەی سەدری ئەعزەم، دیوانی هومایۆن لەگەڵ نەزارەتی ناوەخۆ و دەرەوە و فەرمانگەی شورای دەوڵەت دەگرێتەوە. |
| **باش کاتیب (باش کاتب)** | نووسەری یەکەم یاخود سەرۆکی نووسەران، لە فەرمانگە فەرمییەکاندا ئەرکەکەشی نووسینی نووسراو بووە. |
| **باش کیتابەت (باش کتابت)** | کیتابەت واتە پیشەی نووسین، باش کیتابەت یەکسانە بە باش کاتیب، واتە سەرۆکی نووسین. |
| **باشبوغ** | قوماندانی سەربازی ڕێک نەخراو یاخود نارێک. |
| **باش مودیرەت (باش مدیرت)** | باش بە مانای سەرۆك یاخود یەکەم دێت. مودیرەت واتە بەڕێوەبردنی کاروبارەکان؛ هەرچی باش مودیرەتە بە مانای بەڕێوەبەرایەتی یەکەم یاخود بەرپرسی یەکەمی بەڕێوەبەرایەتی دێت. |
| **بەرائەتی شەریفە** | واتە پاکانەی ئەستۆ و خۆبەرێکردن، لە سەردەمی عوسمانی بۆ وەرگرتنی زەوی کشتوکاڵی یاخود دامەزراندن، دەبووایە لەلایەن پاشاوە یاخود دەوڵەت بەرائەتی شەریفە واتە پاکانەی ئەستۆ وەربگیرێت. |
| **برادەر زادە** | برادەر زادە منداڵی خوشک و برا، هەروەها برازا، پورزا، خاڵۆزا دەکات. |
| **برادەری** | واتە برا. |
| **بلۆک (بلوک)** | دەستەی سەربازی. |
| **بلۆک باشی (بلوک باش)** | سەرۆک یاخود بەرپرسی بلۆک. |

| | |
|---|---|
| **بینباشی (بیکباشی)** | بین بە مانای هەزار دێت، باش واتە سەر، بینباشی، ئەم ئەفسەرەیە یاخود قۆماندانەیە تابورێک بەڕێوە دەبات لە هەزار سەرباز پێک هاتووە. |
| **پلەی حەرەمەین (درجە حرمین)** | بەم کەسە ووتراوە کە تۆبەی کردووە و حەرامی لە خۆی قەدەغەکردووە، زیاتر لە کاتی حەج کردن دەچووە پلەی حەرەم و خراپە و کاری بەدی لە خۆی حەرام دەکرد. لەلایەکی تر لە سەردەمی کۆندا چینی زاناکان دەگرێتەوە، کە لە دوای پایەی میسر لە پێش پلەوپایەی ئیستەنبۆڵ پلەیەکی بەرزە. |
| **تابور** | لەشکری سەربازی، کەرتی سوپا. |
| **تاتار** | نامەی گواستۆتەوە بۆ ناوچەکانی تری دەوڵەت، جولەی زۆر خێرا بووە، جگە لە ناوی تاتار ئەوەی ئەم کارەی کردووە ناوی (ساعی، پۆستە، قاسد، برید)یشی پێ ووتراوە، لە کاتی خۆیدا تاکی تاتار بە خێرا رۆیشتن بەناوبانگ بووە، بۆیە پێیان ووتراوە تاتار. |
| **تەحسیلدار (تحصیلدار)** | ئەم فەرمانبەرەیە  باج و باجی داهات و بەروبوومی داهات کۆدەکاتەوە. |
| **تەرسانە (ترسانە)** | تەرسانە یاخود تەرسخانە  واتە کارگەی دەریایی، ئەم شوێنە بووە کاروباری کەشتییە جەنگیەکان و کاروباری دەریایی تێدا جێبەجێ دەکرا، یەکسانە بە تەرسانەی عامیرە (ترسانە عامرە). |
| **تەغار (تغار)** | ٤ ربە ١ تەغارە. |
| **تەنزیمات (تنظیمات)** | لە رووی زاراوەدا بە مانای رێکخستن و رێکوپێکی و خستنە سەر رێگا دێت، لە سەردەمی عەبدولمەجید لە ٣ قاسمی ١٨٣٩ لە گولخانە خوێندرایەوە، بە ناوی رەشنووسی هومایۆنی گوڵخانە بە فەرمانێکی پاشا هەژمار کرا، لەلایەن رەشید پاشای گەورەش وەکو چاکسازی راگەیەندرا، تا ساڵی ١٨٧٧ی جەنگی رووس بەردەوام بوو، دواتر سنووردار کرا؛ ناوە راستەقینەکەی تەنزیماتی خێرخوازی (تنظیمات خیریە) بوو. |
| **تیمار** | ئەم زەوییە کشتوکاڵیە داهاتی ساڵانەی لە نێوان ٣٠٠٠-٢٠٠٠٠ ئاقچە بووە، ئەم جۆرە زەوییەش بەم سەربازانە دراوە، کە بەشداری شەریان کردووە یاخود بەم کەسانە دراوە کە لە بواری ئایینەوە ئەرکیان پێ سپێردرا بوو، بەم داهاتەش بژێوی ژیانی خۆیان پێ دابین کردووە، واتە لە جیاتی مووچە پێیان دەدرا. |
| **پارە** | وشەیەکی فارسیە، ١ قوروش ٤٠ پارەیە، ١ پارەش دەکاتە ٣ ئاقچە. |
| **پۆست نشین** | بە شێخی تەکیە ووتراوە پۆست نشین، لە هەمان کاتدا بە کەسێك ووتراوە کە پلەیەکی هەبووە و کارەکەی بەرێوە بردووە. |
| **حەرەم (حرم)** | ئەم شوێنەیە، هەموو کەسێك ناتوانێ بە بێ مۆڵەت بچێتە ژوورەوە، بە تایبەتی ئەم شوێنانەی کە تایبەتن بە ئافرەت و ژووری ئافرەت. |
| **جەبەخانە (جبەخانە)** | ئەم کۆگایە بووە هەموو جۆرە چەک و باروت و کەلوپەلی چەکی ئاگری تێدا پارێزراوە. |
| **جەلیلە (جلیلە)** | جەلیلە بە مانای ناوداری گەورە یاخود شکۆدار دێت، کە نووسراو بۆ فەرمانگەی وەزیر و موشیر دەکرا، بەم شێوەیە رێزیان لێ دەگیرا، لە پلەی ئەوان نزمتر پێیان دەوترا بەهییە یا عالییە. |
| **خاخام** | زانا و بەرپرسی یەهودیەکان، واتە کاهین. |
| **خەلافەتپەناهی (خلافتپناهی)** | خەلیفە شوێن گرەوەی کەسێک، کە لە دوای پێغەمبەر وەکو وەکیلی پێغەمبەر کاری کردووە، ئەم ئەرکە لە ئیسلام داهێنرا، پەناهی واتە پەیوەندی، خەلافەت پەناهی واتە شتێک کە پەیوەندی بە خەلیفەوە هەیە و لەلای ئەو دەردەچێت. |

| | |
|---|---|
| **خەیل (خیل)** | تاقم، خەڵکێکی زۆر، بە تاقمی سوارەش دێت. |
| **خولعە (خلعە)** | ئەم جلە چەند جۆرێکی هەبووە، جلی رێز لێنان، جلی پەشیمانی یاخود جلی مردن، ئەم جلەش لەلایەن پاشاوە وەکو پاداشت یاخود رێزلێنان بە کەسێک دەدرا. |
| **داعی** | ئەم کەسە ئەرکی دوعا کردن و نزا کردن بووە. |
| **دەرسەعادەت** | ئیستەنبوڵ پایتەختی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی. |

| دەفتەردار (دفتردار) | سەرۆکی ژمێریاری، بەرپرس لە کاروباری دارایی. |
|---|---|
| دەفتەر خاقانی (دفتر خاقانی) | دەفتەر خانەشی پێ ووتراوە، فەرمانگەیەك بوو، کاروباری پارەی دەوڵەت و موڵك و زەوی و زاری بەڕێوە دەبرد، بۆ نموونە تاپۆ. |
| دزدار | پارێزگاری قەڵا. |
| دوخان | تووتن. |
| دوخانچی | تووتنچی؛ ئە کەسە کاری تووتنی کردووە. |
| ژورنال | ژورنال دەفتەری ڕووداوەکان، یاخود دەفتەری ڕۆژانە. |
| رایج | رایج بەهاکەی تری، واتە نرخەکەی تری یاخود بەهای رابردووی. |
| رەدیف (ردیف) | بەم سەربازانە وتراوە رەدیف، کە لە دواوەی سەربازی ڕێکخراو دەوەستان و لە کاتی پێویستیش چەکیان پێ دەدرا. |
| رەژی (رژی) | فەرمانگەی تووتن. |
| روزهزر و روزقاسم | (Hıdırellez) لە دونیای تورک وەرزێکە جەژنی بۆ ساز دەکرێت، روزی هزر (Ruz-ı Hızır) واتە (رۆژی هزر) کە بە ناوی رۆژی خدری لەز (Hıdırellez) ناو نراوە، بە پێی داستانی ئەم سەردەمە، لەم رۆژەدا لە سەر رووی زەوی پێغەمبەر خدر و ئیلیاس بەیەک گەیشتوون، تاوەکو یارمەتی هەژار و لێقەوماوان بدەن. لە تورکیاش جەژن بۆ ئەم بۆنەیە دەگێردرێت. بە پێی رۆژژمێری زایینی رۆژی خدری لەز لە ٦ مایس، لە کۆنیش بە پێی رۆژژمێری رومی رۆژی ٢٣ نیسان هەژمار دەکرێت. ماوەی نێوان ٦ مایس تا ٨ تشرینی دووەم بە ناوی رۆژەکانی هزر وەرزی هاوین و ماوەی نێوان ٨ تشرینی دووەم تا ٦ مایس بە ناوی رۆژەکانی قاسم وەرزی زستان پێک دەهێنن. بەم شێوەیە رۆژی ٦ مایس تەواو بوونی وەرزی زستان و دەست پێکردنی وەرزی هاوین دەکات. |
| رسوم (رسوم) | باج و باجی گومرگ. |
| رسومات (رسومات) | باجەکانی گومرگ. |
| ریاسەتپەناهی (ریاستپناهی) | پەیوەستە بە سەرۆکایەتیەوە، کە پەیوەستە بە کارەکانی پاشا. |
| ریال | ریال پارەی زیوی ئاسیاوییە، دەکاتە ٢٥ قوروش. |
| ریکابی هومایۆنی شاهانە (رکاب هومایونی شاهانە) | سەربازە سوارەکانی پاشا. |

| ریکابی هومایۆنی قەپوچی باشی | بەرپرسی یاخود سەرۆکی دەرگای سەربازە سوارەکانی پاشا. |
|---|---|
| زەربخانەی عامیرە (ضربخانە العامرە) | ئەم شوێنە پارەی دەوڵەتی تێدا دروست دەکرا. |
| سالیانە | ئەم باجەیە ساڵی جارێك وەردەگیرێت، لە پێش تەنزیمات بەشێك لە فەرمانبەران و بەکارهێنراوان بەرامبەر بە ئەرکەکەیان، ساڵی جارێك کرێیان پێ دراوە. |
| سەدارەت (صدارت) | شوێنی کاری سەدری ئەعزەم و پلەکەیەتی. |
| سەدارەتپەناهی | پەیوەندی بە سەدری ئەعزەمەوە هەیە، واتە ئاماژەیە بۆ سەدری ئەعزەم. |
| سەدری ئەعزەم (صدر اعظم) | پلەکەی وەکو سەرۆک وەزیرانی ئێستا بووە، یاخود وەکیلی پاشا بووە. |

| | |
|---|---|
| **سەر عەسکەر (سر عسكر)** | سەر وشەیەکی فارسیە بە واتای سەر دێت، سەر عەسکەر بە واتاکانی ئێستا بە مانای سوپا سالار، سەر لەشکر، سەرکردەی سوپا، قوماندان دێت. |
| **سەر کاتیب (سر كاتب)** | سەرۆک یاخود یەکەم نووسەر. |
| **سەعادەت (سعادت)** | واتە خۆشی. |
| **سەفەربەرلیك (سفربرلك)** | بەم کەسانە ووتراوە کە خۆیان ئامادە کردووە، تا بچنە شەر یاخود بۆ چوونە شەر لە ئامادەباشی دابوونە. |
| **سەلاملك (سلاملك)** | لە کۆشکە گەورەکاندا بەم ژوورە دەوترا کە بۆ پێشوازی کردن لە میوانان تەرخان کرابوو. |
| **سوریچی** | ئەم پیاوەیە سەرپەرشتی ئاژەڵە بارهەڵگرەکان یاخود بارگیرەکان دەکات، واتە کرێچیە، وەکو خزمەت بەکرێ گیراوە، تا بارگیرەکان بە رێگا ببات. |
| **سیپاهی (سپاهی)** | ئەم سەربازە سوارەیە خاوەنی زەوی کشتوکاڵییە، لە لەشکری عوسمانی کۆندا چینێک سەربازی سوارە هەبوو، لە بەرامبەر ئەم دە یەکە (عشر) کە لە زەوی کشتوکاڵی وەریاندەگرت لەگەڵ ئەم ئاژەڵانەی کە خۆیان بەخێویان دەکرد، بەشداری جەنگیان دەکرد، بەڵام کەلوپەلی جەنگی لەلایەن دەوڵەتەوە پێی دەدرا. |
| **سیپاهیدار (سپاهدار)** | گەورەترین سەرباز، سەر عەسکەر. |
| **سیلاحشۆر (سلاحشور)** | واتە پیاوی چەکدار، ئەم پیاوانە بوونە لە چەك هەڵگرتن و بەکارهێنانی شارەزاییەکی تەواویان هەبووە، لە جەنگدا بە چەك شەڕیان کردووە. |
| **شاهنشاه** | گەورەترین پاشا یا شا، واتە پاشای پاشایان یاخود شای شایان. |
| **شەهبەندەر (شهبندر)** | بە واتای باڵیۆز دێت، لە سەردەمی مەحمودی دووەم، بۆ پاراستنی بازرگانە موسڵمانەکانی ناوەخۆ، لە نێوان خۆیان کەسێکیان هەڵدەبژارد، تا هەر ناکۆکی و لێك تێنەگەیشتنێك هەبێت چارەسەری بکات. |
| **شورای دەوڵەت بە زمانی عوسمانی (شورای دولت)** | پێش ئەم دامەزراوەیە، ئەنجوومەنی والا کارەکانی ئەنجام دەدا، دوای هەڵوەشاندنەوەی ئەنجوومەنی والا، لە ساڵی ١٨٦٨ شورای دەوڵەت دامەزرا، جۆری کارەکەی لە کاری کارگێڕی پێک دەهات، ئەرکەکەشی دۆزینەوەی چارەسەر بۆ کێشە کارگێڕییەکان و دەرکردنی یاسای گونجاو بوو، ئەم دامەزراوەیە تا ساڵی ١٩٢٢ بەردەوام بوو. |

| | |
|---|---|
| **چاوش** | وشەیەکی تورکیە، لە رووی سەربازییەوە سەربازی پلە بچووکە، ئەمڕۆش بە پلەی پاسەوان دێت. |
| **چەڵتوك (چلتوك)** | برنج. |
| **ڤۆیڤۆدە** | لە سەردەمی عوسمانیەکاندا فەرمانبەرێک بووە سەر بە خەزینە، ئەم داهاتانەی رێک دەخست کە لەلایەن خانم، ئەفەندی، سەدری ئەعزەم، وەزیر، بەگی بەگان و بەگی سانجەقەکانەوە دەهات، هەروەها ئەمانە ئەرکی پاراستنی ئاسایش و رێکخستنی شوێنە تایبەتیەکانیان پێ درا بوو، لە بەرێوەبردندا پیاوی بەهێز بوون، بۆیە ناوە ناوە کێشەیان بۆ دەوڵەتی عوسمانی دروست دەکرد. |
| **عولوفە (علوفە)** | ئەم زاراوەیە بەم سەربازانە دەوترا، کە سێ مانگ جارێک مووچەیان وەردەگرت. |
| **فەریق (فريق)** | واتە تاقم، تیپ، دوو لایەن، کۆمەڵە خەڵکێکی زۆر، بە پلەی سەربازیش دێت، لە چینی سەربازی لە دوای موشیر دەهات، ئەویش گەورەترین پلەی سەربازی بوو. |
| **فرقە** | دەستە، کۆمەڵ. |
| **قەپوچوقدار (قپوچوقدار)** | ئەم فەرمانبەرانە بوون کە لە بابی عالی ویلایەت، لە خزمەتی قەپوکەتهودا دابوون و هەندێک داواکاری والییان جێبەجێ دەکرد. |
| **قەپوچی باشی** | بەرێوەبەری ئەم چینەیە، کە لە بەردەم دەرگای کۆشک وەستاون. |

| | |
|---|---|
| قەپوکەتهودا (قپوکتهودا) | قەپوکەتهودا خزمەتکاری بەر دەرگا بوو. |
| قەساس (قصاص) | سزای شەرعی بکوژی کوژراو و بریندارکاری بریندارکراوەکەیە، بۆ میراتی کوژراو داوای قەساس دەکەن. |
| **قپوچی باشی (قپوچی باشی)** | قەپوچی بە دەرگای فەرمانگە و شوێنە فەرمییەکانی دەوڵەت دەوترا، کە خەڵک بۆ ئیشوکارەکانیان لەم دەرگایە دەچوونە ژوورەوە و دەهاتنە دەرەوە، بێگومان ئەم دەرگایانەش بەرپرس و سەرۆکیان هەبووە، جگە لەمە قەپوچی باشیش پلەیەک بووە، دراوەتە فەرمانبەرانی دەوڵەت، بۆ نموونە ریکابی هومایۆنی قەپوچی باشی (رکاب هومایونی قپوچی باشی). |
| **قۆل ئاغا (قول اغا)** | بە واتای قۆڵ، لێرەش قۆڵی ئاغا یەکسانە بە ئەفسەری قۆڵی تابور، یا خود یاریدەدەری بینباشی، قۆڵی راست و چەپی ئاغا. |
| **قولی** | قول؛ ئەم پیاوەیە بۆ ئەرك جێبەجێ کردن دەکردرێت، هەرچی قولی؛ ئەم فەرمانبەرەیە بۆ چاودێری کردنی سەربازانی دوژمن و سەرپەرشتی کردنی زەوی و زار ئەرکی پێدەدرێت. |
| **قوماندان** | قوماندان سەرۆک یاخود بەرپرسی ئەفسەر دەکات، وەکو قوماندانی تابور، قوماندانی لەشکر، قوماندانی ئالای، قوماندانی ژاندارمە. |
| **قۆناغ (قوناغ)** | قۆناغ واتە مەنزل، لەسەر رێگا بۆ گەشتیاران و کاروانچیان دروست دەکرا، تا تێدا بحەسێنەوە و بخەون، هەروەها بۆ دەستنیشانکردنی دووری شوێنێک دەیانووت سێ قۆناغ یاخود چوار قۆناغ دوورە، واتە چەند قۆناغ لە نێوان ئەم دوو ناوچەیە هەبوایە هەژمار دەکرا، جگە لەمە بە کۆشکی پاشا و گەورەکان دەوترا قۆناغ یا قۆناق. فەرمانگەی حکوومەتیش پێی وتراوە قۆناغ وەکو قۆناغی حکومەت، کە هۆبەیەک لە هۆبەکانی فەرمانگەی فەرمی حکومەت پێی دەوترا قۆناغی حکومەت. |
| **قیە** | دەکاتە گرانی ٤٠٠ درهەم، بۆ دە یەکیش بە واتای کیلۆ دێت، کە ١٠٠٠ گرام دەکات. |
| **کەتهودا (کتهودا)** | واتە خزمەتکار ئەوانەی پلەکەیان لە فەرمانبەر نزمتر بوو، پێیان دەوترا خزمەتکار. |
| **کەلەك (کلك)** | ئەم پارچە دارانەن کە بە ئاو ئەستوور کراون و لە پاڵ یەکتر بە داو بەیەکتریەوە بەستراونەتەوە و تەختەیەکیان لێ پێکهێنراوە، لە رووبارەکانی جەزیرە بە تایبەتی لە دیجلە بۆ گواستنەوەی مرۆڤ و کەلوپەل بەکار هاتووە، ئەم کەلەکە بە گوێرەی گەورەییەکەی بۆ بەرێوەبردنی ٢ تا ٦ پیاوی پێویستە. دوای تەواو بوونی گەشتەکە بە تایبەتی لە سەر رووباری دیجلە تا دەگاتە بەغداد بەشی دارەکانی کەلەکەکە زۆر جار بە نرخێکی هەرزان دەفرۆشرا، هەروەها قازانجی راستەقینەی کەلەکچیەکان ئەم کرێیە بووە، کە لە کاروانچیەکان وەریاندەگرت. ئەم کەلەکچیانە لەسەر رووباری دیجلە تا خوارەوە کەرستەی بیناکاری و دانەوێڵە و باری گرانیشیان بار دەکرد. لە جەنگی جیهانی یەکەم سەربازیشیان پێ گوازراوەتەوە. |

| | |
|---|---|
| **کیل** | کیل، بۆ پێوانی دانەوێڵە بەکارهاتووە. |
| **گاردیان** | فەرمانبەری گرتووخانە. |
| **مەشروتیەت (مشروطیت)** | مەشروت واتە مەرجدار کە پەیوەستە بە مەرجەکانەوە، مەشروتەش لەلایەن یەکەم خاوەنیەوە بە مەرجی نەفرۆشتن بۆ میراتگرەکانی بەجێی هێشتووە، ئەویش وەکو خانوو، زەوی کشتوکاڵی، نەخۆشخانە، مزگەوت، هەرچی مەشروتیەتە ئەوا ئەم حوکمدارە دەگرێتەوە کە لە ژێر دەسەڵاتی سەرۆکایەتیە. |
| **مەمالیکی مەحروسەی شاهانە (ممالیکی محروسە شاهانە)** | ووڵـاتی عوسمانی. |
| **مەمالیك (ممالك)** | ووڵاتەکان، مەملەکەتەکان، خاکی ووڵاتێك. |
| **مەملوک (مملوک)** | کەسێک پارەی هەبێت، یاخود بەندە، کۆیلە. |
| **مەنزل** | لە بنەرەتدا وشەیەکی عەرەبیە، بە زۆر مانا دێت، ئەوەی لە زمانی عوسمانیدا پێویستە بە مانای کۆشک، شوێنی کوشک، سەرە رێگای یەک رۆژ دێت، یاخود بە مانای دووری نێوان دوو کۆشک دەکات، تاتارەکان لە کاتی بردنی پۆستە بۆ ناوچەکانی تر، لەم مەنزیلانە هاتوونەتە خوارەوە و حەساونەتەوە، هەروەها ئەسپیان گۆریوەتەوە، یاخود شەویان لەوێ بەسەر بردووە. |

| | |
|---|---|
| **موشیر (مشیر)** | بە مانای ئاماژە پێکردن دێت، لەلایەکی تر لە چینی سەربازی یەکسانە بە وەزارەت، کە گەورەترین پلەی سەربازییە، بۆ نموونە موشیری لەشکر، موشیری تۆپخانە. |
| **موعەججەلە (معجلە)** | موڵکی میریە و لە وەقف دیارە، هەر لە وەقف مامەڵەی بۆ دەکرێت، کە پارەکەی پێش وەختە دەدرێت. واتە بە شێوەی بەکرێدان و وەرگرتنی پارەی پێشەکی لەلایەن ئاوقافەوە دەبێت. |
| **موقاتەعە (مقاطعە)** | ئەم زەوییانە بوونەن، کە خاوەندارێتی بۆ دەوڵەت یاخود وەقفەکان بووە، بە شێوەی ڕێککەوتن و بە کرێ دراوەتە کەسی تایبەت و دامەزراوەکان، جگە لەمەش بڕی پارەکە دیاری دەکرا و ئەم پارەیەش ڕاستەوخۆ دەچووە خەزینەی دەوڵەت. |
| **میعمارباشی (معمارباشی) (سەرۆکی بیناسازی)** | سەرۆکی بیناسازی، کاری سەرپەرشتیکردنی بیناسازی، هەروەها لە پیشەکەی خەریکی دابەشکردن و ڕێکخستنی کارەکەی بووە. |
| **نازر (ناظر)** | لە بینین هاتووە، واتە سەیرکردن، کە لە هەموو شوێنێک ئامادە و سەیرکەرە، ئەرکەکەشی بەڕێوەبردن و بەڕێکردنی کاروبارەکانە، وەکو نازری دارایی. |
| **نەزارەت (نظارت)** | لە زاراوەی بینین هاتووە؛ واتە چاودێری کردن و بینینی دەورووبەر. لەلایەکی تر بە مانای سەرۆکایەتی و بەڕێوەبردنی کاروبارەکان دێت. لەم سەردەمەدا بە مانای وەزارەت دێت. |
| **هومایۆن (همایون)** | پاشا. |
| **وەکالەتپەناهی (وکالتپناهی)** | پیشەی سەدری ئەعزەم، ئەم کارەیە کە پەیوەندی بە سەدری ئەعزەمەوە هەیە، یەکسانە بە سەرۆکی بریکار. |
| **یوزباشی** | لە بنەڕەتدا بە مانای ١٠٠ کەس دێت، لە ڕووی سەربازییەوە ئەم ئەفسەرە دەگرێتەوە کە قۆماندانیەتی بلۆکێک دەکات لە ١٠٠ سەرباز پێکهاتوون، بۆ نموونە یوزباشی سوارە، یوزباشی پیادە، یوزباشی ژاندارمە، یوزباشی ڕەدیف. |
| **یوک** | یوک بە مانای بار دێت، هەڵگرتنی بار ئینجا چ لەلایەن مرۆڤەوە بێت یاخود ئاژەڵ وەکو بارگیر و ئەسپ و گوێدرێژ، لەلایەکی تر بە مانایەکی تریش دێت، کە یەک یوک دەکاتە بڕی ٥٠٠ هەزار قوروش. |

| | |
|---|---|
| **مەسڵەحەتگوزار (مصلحتگذار)** | بریکاری باڵیۆز، ئەم فەرمانبەرەیە بە شێوەیەکی کاتی کاری باڵیۆزخانە دەکات. |
| **کارپەرداز (کارپرداز)** | ڕێکخەری کار، باڵیۆز، شەهبەندەر. |
| **ئیلتیزام (التزام)** | بەشێکی داهاتی دەوڵەتی عوسمانی لە بەرامبەر شوێنگرەوەیەکی دیاریکراو واتە کرێ لەلایەن دەوڵەتەوە دراوەتە خەڵک، ئەوەی بەرپرسیش بوو لە کۆکردنەوەی کرێیەکە واتە باجەکە پێی دەوترا پەیوەستکراو یاخود پابەندکراو (ملتزم). |
| **زەبتیە (چبگیە)** | لە ڕێکخەر و پەیوەست کردنەوە هاتووە، دەکاتە سەرباز، ژاندارمە، پۆلیس وەکو زەبتیەی سوارە، نەفەری زەبتیە. |
| **تەرەکە (ترکە)** | ووشەیەکی عەرەبیە بە مانای بەجێهێشتن دێت، ئەو شتانەی مردوو لە دوای خۆیدا بەجێی دەهێڵێت پێی ووتراوە تەرەکە. |
| **رسوماتی اهلیە** | جۆرە باجێکە بۆ دابین کردنی پێداویستی بە پەلەی دەوڵەت لە ئاژەڵ خۆماڵی وەرگیراوە، وەکو مەڕ، بزن، مانگا، گوێدرێژ. |

## کـۆد و ووشـەی رەسـەنـی کـۆدەکـان

| | | |
|---|---|---|
| A.AMD. | Bab-i Âsafî<br>Âmedî Kalemi | بابی عەسافی |
| A.DVN. | Sadaret<br>Divan Kalemi Evrakı | سەدارەت، کاغەزەکانی دیوانی قەڵەم |
| A.E.I. ABDÜLHAMİD. | Ali Emiri Tasnifi I. Abdülhamid | پۆلینکردنی میری عەلی، عەبدولحەمیدی یەکەم |
| A.E.III. OSMAN. | Ali Emiri Tasnifi III. Osman | پۆلینکردنی میری عەلی، عوسمانی سێیەم |
| A.E.III.AHMED. | Ali Emiri Tasnifi III. Ahmed | پۆلینکردنی میری عەلی، ئەحمەدی سێیەم |
| A.E.III.MUSTAFA. | Ali Emiri III. Mustafa | پۆلینکردنی میری عەلی، مستەفای سێیەم |
| A.MKT. | Sadaret<br>Mektubi Kalemi | سەدارەت، قەڵەمی تۆمار |
| A.MKT.DV. | Sadaret<br>Mektubi Kalemi Deavî | سەدارەت، دیوانی قەڵەمی تۆمار |
| A.MKT.MHM. | Sadaret<br>Mektubi Kalemi Mühimme | سەدارەت، قەڵەمی تۆمارە گرنگەکان |
| A.MKT.MİTM. | B.E.O. Sadaret Evrakı | بابی عالی، کاغەزەکانی سەدارەت |
| A.MKT.MVL. | Sadaret<br>Mektubi Kalemi Meclis-i Vala | سەدارەت، قەڵەمی تۆماری ئەنجوومەنی والا |

| A.MKT.NZD. | Sadaret<br>Mektubi Kalemi Nezaret Ve Devair | سەدارەت، قەڵەمی تۆماری نەزارەت و دیوان |
|---|---|---|
| A.MKT.UM . | Sadaret<br>Mektubi Kalemi Umum Vilayet | سەدارەت، قەڵەمی تۆماری گشت ویلایەتەکان |
| BEO. | Babıali Evrak Odası | کاغەزەکانی ژووری بابی عالی |
| C.AS. | Cevdet<br>Tasnifi Askeriye | جەودەت، پۆلینکردنی سەربازی |
| C.EV. | Cevdet<br>Evkaf | جەودەت، ئاوقاف |
| C.NF. | Cevdet<br>Nafia | جەودەت، نافیە |
| C.T. | Cevdet<br>Timar | جەودەت، تیمار |
| DH.EUM.EMN. | Dâhiliye Nezareti<br>Emniyet-i Umumiye Müdüriyet Şubesi | نەزارەتی ناوەخۆ، یەکەی بەڕێوەبەرایەتی ئەمنیەتی گشتی |
| DH.EUM.MKT. | Dâhiliye Nezareti<br>Emniyet-i Umumiye Müdüriyeti Posta Mecmuası | نەزارەتی ناوەخۆ، بەڕێوەبەرایەتی کۆمەڵەی پۆستەی ئەمنیەتی گشتی |
| DH.I.UM.EK. | Dâhiliye Nezareti<br>İrade-iUmummiye Ekleri | نەزارەتی ناوەخۆ، پاشکۆی فەرمانی گشتی |
| DH.ID. | Dâhiliye Nezareti İrade | نەزارەتی ناوەخۆ، فەرمان |

| | | |
|---|---|---|
| **DH.MB.HPS.** | **Dâhiliye Nezareti**<br>**Meban-i Emiriye-Hapishâneler** | **نەزارەتی ناوەخۆ، بینایەکانی میری-گرتووخانەکان** |
| **DH.MB.HPS.M.** | **Dâhiliye Nezareti**<br>**Meban-i Emiriye Hapishâneler Müdüriyeti** | **نەزارەتی ناوەخۆ، بەڕێوەبەرایەتی گرتووخانەکانی بینایەی میری** |
| **DH.MKT.** | **Dâhiliye Nezareti**<br>**Mektubi Kalemi** | **نەزارەتی ناوەخۆ، قەڵەمی تۆمار** |
| **DH.ŞFR.** | **Dâhiliye Nezareti**<br>**Şifre Kalemi** | **نەزارەتی ناوەخۆ، قەڵەمی شیفرە** |
| **DH.SN.THR.** | **Dâhiliye Nezareti**<br>**Sicill-i Nüfus idare-i umumiyesi tahrirât Kalemi** | **نەزارەتی ناوەخۆ، تۆماری ناسنامە، فەرمانی گشتی قەڵەمی تۆمارکردن** |
| **DH.TMIK. M.** | **Dâhiliye Nezareti**<br>**Tesr-i Muamelat Ve Islahat Komisyonu Muamela** | **نەزارەتی ناوەخۆ، مامەڵەی قۆمیسیۆنی چاکسازی و مامەڵەی بەپەلە** |
| **DH.TMIK.S.** | **Dâhiliye Nezareti**<br>**Tesrî-i Muamelat ve Islahat Komisyonu** | **نەزارەتی ناوەخۆ، قۆمیسیۆنی چاکسازی و مامەڵەی بەپەلە** |
| **DH.UMVM.** | **Dâhiliye Nezareti**<br>**Umur-i Mahalliyye Ve Vilayat Müdürlüğü Kataloğu** | **نەزارەتی ناوەخۆ، کاروباری دارایی و کەتەلۆگی بەڕێوەبەرایەتی ویلایەت** |
| **HR.MKT.** | **Hariciye Nezareti**<br>**Mektubi Kalemi Evrakı** | **نەزارەتی دەرەوە، کاغەزەکانی قەڵەمی تۆمار** |

| | | |
|---|---|---|
| HR.SYS. | Hariciye Nezareti<br>Tahrirat-ı Hariciye Odası | نەزارەتی دەرەوە، ژووری تۆماری دەرەوە |
| I.AS. | Irade Askeri | فەرمانی سەربازی |
| İ.DH. | Irade Dâhiliye | فەرمانی ناوەخۆ |
| I.DUIT. | Irade Dosya Usulü Iradeler Tasnifî | ڕێگاکانی فەرمانی دۆسیە، پۆلینکردنی فەرمان |
| I.HB. | Irade Harbiye | فەرمانی جەنگی |
| I.HUS. | Irade Hususi | فەرمانی تایبەتی |
| İ.ML. | Irade Maliye | فەرمانی دارایی |
| İ.MMS. | Irade Meclis-i Mahsus | فەرمانی ئەنجوومەنی تایبەت |
| I.MVL. | Irade Meclis-i Vâlâ | فەرمانی ئەنجوومەنی والا |
| I. ŞD. | Irade Şura-yı Devlet | فەرمانی شورای دەوڵەت |
| İ.TAL. | Irade Taltifat | فەرمانی ڕێزگرتن و بەخشین |
| İE.EV. | Ibnulemin Tasnifi Evkaf (Vakıf) | پۆلینکردنی وەقفی ئیبنولئەمین |
| MF.MKT. | Maarif Mektubi Kalemi | قەڵەمی تۆماری مەعاریف |
| MV. | Meclis-i Vükela<br>Meclis-i Vükela Matbataları | ئەنجوومەنی بریکارەکان، چاپکراوەکانی ئەنجوومەنی بریکارەکان |

| | | |
|---|---|---|
| MVL. | Meclisi Vâlâ | ئەنجوومەنی والآ |
| MVL. | Meclis-i Vâlâ<br>Meclis-i Vâlâ Evrakı | ئەنجوومەنی والآ، کاغەزەکانی ئەنجوومەنی والآ |
| Ş.D. | Şura-yı Devlet Evrak | کاغەزەکانی شورای دەوڵەت |
| Y.A.HUS. | Yıldız<br>Sadâret Hususi | ئەستێرە، تایبەت بە سەدارەت |
| Y.MTV. | Yıldız<br>Mütenevvi Maruzât Evrakı | ئەستێرە، کاغەزی داواکاریە وون بووەکان |
| Y.PRK. AZJ | Yıldız<br>Perakende, Arzuhâl ve Jurnaller Kataloğu | ئەستێرە، نارێك، کەتەلۆگی داواکاری و ژورنال |
| Y.PRK.ASK. | Yıldız<br>Tasnifi Perakende Evrakı Askeri Maruzat | ئەستێرە، پۆلینکردنی نارێکی کاغەزەکانی داواکاری سەربازی |
| Y.PRK.DH. | Evrakı Dâhiliye Nezareti Maruzatı | کاغەزەکانی داواکاری نەزارەتی ناوەخۆ |
| Y.PRK.PT. | Yıldız<br>Perakende Posta ve Telgraf | ئەستێرە، پۆستە و تەلەگرافی نارێك |
| Y.PRK.SH. | Yıldız<br>Tasnifi Perakende Evrakı Sıhhıye Nezareti Maruzatı | ئەستێرە، پۆلینکردنی کاغەزی داواکاریە نارێکەکانی نەزارەتی تەندروستی |
| Y.PRK.UM. | Evrakı Umum Vilayetler Tahriratı | کاغەزی گشتی، تۆماری ویلایەتەکان |




A.}MKT.NZD.00063.00010.001

| A.MKT.NZD | 00063.00010 | 20 موحەررەم 1269/ 3 تشرینی دووەم 1852 |
|---|---|---|
| لە ناو ویلایەتی بەغداد لە سەنجەقی عنە و هیت موتەسەرفی پێشووی عەمادیە میری میران ئیسماعیل پاشا و بۆ قەزای خانەقینیش لە خانەدانی کەرکوك قائیمقام مەحمود بەگ و لە قەزای سامەرا بەرێوەبەر جەبەلان بەگ دامەزرێن، بە فەرمانی شەریفە، مەکتوبی سەدری ئەعزەم دەرچووە، هەواڵ دراوەتە ژووری ئەفەندم. مۆری ئەلسەید حیشمەت عەبدولقادر | | |



HR.MKT.00132.00048.001

| HR.MKT | 00132.00048 | 4 جەمادی یەکەم 1272/ 12 کانوونی دووەم 1856 |
|---|---|---|

جەنابی فەتحی پاشا
لەبارەی دامەزراندن و دانانی کەرەنتینەی خانەقین لەسەر هەندێك ووتە لەلایەن باڵیۆزخانەی ئێران راپۆرت بەرز کراوەتەوە، لەسەر فەرموودەی والا هاوپێچ نێردراوە، بە خوێندنەوەی فەرمانی موشیری پاشا ئاماژە و راپۆرتی ناوهاتوو رەوان کراوەتەوە، لەم بابەتەدا فەرمان بۆ ئەفەندیمانە.

وەڵامی پاشا بۆ نەزارەتی بازرگانی
لەبارەی بابەتەکە ئاماژەی والا کراوەتە نووسراو، بە تێروانین لە وێنەی ئاماژەکە لە بارەی دەستگیرکردنی ناوبراو خۆی لە بازرگانانی ئەوروپا نیشان نەداوە و لە دەستیشی پاکانە نەبینراوە، هەر چییەك بێت دوای مۆڵەت روون بکرێتەوە ئەم قسەیە نەبێتە هەڵتێگەیشتن، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە.




HR.MKT.00380.00034.002

| HR.MKT | 00380.00034 | 4 زیلقەعدە 1277/ 14 مایس 1861 |
|---|---|---|
| بۆ لایەنی جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت<br>راگەیەندراوی بەندەمانە<br>ساڵی پار چەند دزێك لە هاوڵاتیانی ئێران چوونەتە خانەی مۆسیۆ ناتین پزیشکی کەرەنتینەی خانەقین سەر بە بەغداد، کەلوپەل و پارەوپولیان دزیوە و چوونەتەوە ئێران، پشت بەستن بە بریارنامەی پاشا، والی بەغداد هەوڵی داوە بە ڕێگەی باڵیۆزخانە هەوڵی داوە کەلوپەلە دزراوەکان بگەڕێنیتەوە، بەڵام هەندێك هۆکار ڕێگر بوون بۆ گەراندنەوەی کەلوپەلە دزراوەکان بە تێروانین لە ئاماژەی ناوەخۆ، بە باڵیۆزخانەی عوسمانی لە تەهران رابگەیەندرێت، بۆ ئەم مەبەستە بریارنامەی پاشای جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت بە مەزبەتەی ئەنجوومەنی ناوەخۆ ئاماژەی پێکراوە، بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بە دەستەوەیە. | | |



HR.MKT.00382.00083.001

| 23 زیلحیجە 1277 /2 تەمموز 1861 | 00382.00083 | HR.MKT |
|---|---|---|

نووسراوی پایەبەرز بۆ باڵیۆزخانەی عوسمانی لە تەهران

ساڵی رابردوو عەشیرەتی سنجابی ئێرانی هاتوونەتە دەورووبەری خانەقین لەگەڵ عەشیرەتەکانی دەوڵەتی عوسمانی بەناوی عەشیرەتی بەنی وەیس و رەبیعە رووبەرووی یەکتر بوونەتەوە و شەریان کردووە، لە هەردوولا چەند کەسێك کوژراوە و کەلوپەل تاڵان کراوە، بەڵام بە ووردبینی کردن راستییەکان دەردەکەون، بۆیە لەلایەن فەرمانبەرانی دەوڵەتی عوسمانی ئامادەکاری کراوە، دیسان بەشێك لە عەشیرەتەکانی ئێران دەستیان بە جموجۆڵ کردووە، فەرمانبەرانی ئێرانیش لەلایەن خۆیانەوە هیچ هەنگاوێکیان نەهاوێشتووە بۆ چارەسەرکردنی ئەم بابەتانە، ئەم کەلوپەلانەی کە تاڵانیان کردووە و لەلایانە دوای یەکلاییکردنەوە پێویستە کەلوپەلە تاڵان کراوەکان رادەستی خاوەنەکانیان بکرێت و خوێنی کوژراوەکانیش بدرێت، دوای ئەمەش رێگە نەدرێت سەرپێچی ئەنجام بدرێت، نووسراوی جەنابی پاشای والی بەغداد بە هاوپێچ رەوان کراوە، بە تێروانین لە وێنەی ئاماژەکە فەرمانبەرانی ئێران رێگە نەدەن جولە لە نێوان هەردوو دەوڵەت هەبێت، بۆ ئەمەش چۆنیەتی کارەکە بە پەیوەندیداران رابگەیەندرێت.




HR.MKT.01112.00073.001

| HR.MKT | 01112.00073 | 13 رەبیعی کۆتایی 1279/ 8 تشرینی یەکەم 1862 |
|---|---|---|
| نووسراوی پایەبەرز بۆ باڵیۆزخانەی عوسمانی لە تەهران لە بارەی هێلی تەلەگرافی خانەقین لەگەڵ دەوڵەتی ئێران مقاوەلەنامە رێکخراوە و واژوو کراوە، بە پۆستەی باڵیۆزخانەی ئینگلتەرا نێردراوە، نووسراوی مێژووی ١١ رەبیعی یەکەم ١٢٩٧ ژمارە ٣٠ ی باڵیۆز و مقاوەلەنامەی ناوهاتوو بەرز کراوەتەوە بۆ نەزارەت، هۆکاری تێکچوونی ئەمنیەتی هێلی ناوهاتوو بە ئامۆژگاری و ئاماژە بۆ نەزارەت بەرز کراوەتەوە. | | |





HR.MKT.00419.00092.001

| HR.MKT | 00419.00092 | 14 جەمادی کۆتایی 1279/ 7 کانوونی یەکەم 1862 |
|---|---|---|
| نووسراوی پایەبەرز بۆ باڵیۆزخانەی عوسمانی لە تەهران بۆ درێژکردنەوەی هێڵی تەلەگرافی دەوڵەتی ئێران لە تەهران تا خانەقین و بەستنەوەی بە هێڵی بەغداد، لەلایەن دەوڵەتەوە بڕیار دراوە لە نێوان بەغداد و خانەقین هێڵێك دروست بكرێت، لەم دواییەدا نووسراوی مێژووی ١١ جەمادی یەکەم ١٢٧٩ و ٢٢ تشرینی یەکەم ١٢٧٨ هاتووە، بۆ ئەمەش ئارەزوو دەكرێت هێڵی خانەقین درێژ بكرێتەوە، بۆ ئەم مەبەستەش لە نێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی مقاوەلەنامەیەك ڕێك بخرێت، یەك بە یەك ئەم هێڵەی لە تەهران تا خانەقین دروست دەكرێت باس بكرێت، بۆ جێبەجێ كردنی كارەكەش مقاوەلەنامەكە ئامادە بكرێت. | | |



HR.MKT.00459.00043.001

| HR.MKT | 00459.00043 | 25 جەمادی یەکەم 1280/ 7 تشرینی دووەم 1863 |
|---|---|---|

تەلەگرافنامەی پاشا بۆ والی بەغداد

ئـەم هێـڵـەی لـە بەغـداد بـۆ بـەسرا و خانەقیـن درێـژ دەبێتـەوە، باشـترە و پارێزراوتـر دەبێـت لـە ڕێگایەکـی داخـراو تێپەڕێـت، بـە گفتوگـۆی نێـوان والا و باڵیـۆزی ئینگلتـەرا ئـەو ئەنجامـەی بەدەسـت دێـت بڕیـاری لەسـەر بدرێـت و جێبەجـێ بکرێـت، لـە مێـژووی ١٦ جەمـادی یەکـەم ١٢٨٠ بـە تەلەگـراف ئامـاژەی پێکـراوە، لـە بـارەی ئـەم هێڵانـەوە لـە نێـوان بابـی عالـی و باڵیـۆزی ئینگلتـەرا مەزبەتـە ڕێکخـراوە، وێنەیەکـی بـە پۆسـتە ڕەوان کـراوە.




HR.MKT.00454.00034.001

| HR.MKT | 00454.00034 | 9 ڕەبیعی کۆتایی 1280/ 23 ئەیلوول 1863 |
| --- | --- | --- |

نووسراوی سەدری ئەعزەم بۆ کارگێری تەلەگراف

لەلایەن دەوڵەتی ئێرانەوە لە سەر سنووری بەغداد تا خانەقین هێڵێکی تەلەگراف دروست دەکرێت، لەلایەن دەوڵەتی عوسمانیشەوە هێڵی بەغداد تا هێڵی ناوچەی ناوهاتوو دروست دەکرێت، دەوڵەتی ناوهاتوو ئارەزوو دەکات هەردوو هێڵ بەیەکتریەوە ببەسترێتەوە، لەلای ئێمەش لەسەر خوێندنەوەیە، لە کاتی وەڵامدانەوەی هەردوو ووڵات بڕیارێك دەدرێت و ڕێك دەخرێت، بۆیە فەرمان بدرێت لە دەوڵەتی عالی بڕیارێك ڕێك بخرێت بۆ دروست کردنی هێڵی ناوهاتوو، هەروەها لەلایەن باڵیۆزخانە راپۆرت پێشکەش کراوە و هاوپێچ نێردراوە، بە تێروانین لە بابەتەکە ئەم خوێندنانەی کە کراوە بە ئاماژە کردن لەگەڵ راپۆرتی ناوهاتوو ڕەوان بکرێتەوە.



OSMANLI ARŞİVİ
HR.MKT
443 | 31 | 1

HR.MKT.00443.00031.001

| HR.MKT | 00443.00031 | 18 موحەررەم 1280/ 5 تەمموز 1863 |
|---|---|---|
| نووسراوی سەدری ئەعزەم بۆ کارگێری تەلەگراف<br>دەوڵەتـی ئینگلتـەرا و عوسـمانی لـە نێـوان بەنـدەر بوشـیر و بەغـداد، بـە تەلەگـراف پەیوەنـدی دەبەسـتن، لـە نووسراوەکانـدا هەندێـك بەسـەر بـەسرا و هەندێکیـش لـە سـنووری ئێـران بـە ڕێگـەی خانەقیـن لـە ناوچەکانـی ئێـران هێڵـەکان تێدەپەڕێـت، ڕاپۆرتـی ١٦ زیلقەعـدە ١٢٧٩ بـە نـووسراو ڕەوان کـراوە، ئەمجـارە بـە هەندێـك ڕوون کردنـەوە و شـیکردنەوە لەلایـەن نەزارەتـی ناوهاتـوو ڕاپـۆرت دراوە، وەرگێراوەکـەی تێروانینـی ئێـوەی لەسـەرە و هاوپێـچ ڕەوان کـراوە، لەسـەر ئـەم ڕوون کردنەوانـە خوێندنەوەتـان رادەگەیەندرێـت، بـە ڕاپۆرتـەوە ڕەوان دەکرێتـەوە. | | |




HR.MKT.00474.00008.001

| HR.MKT | 00474.00008 | 18 شەوال 1280/ 27 مارت 1864 |
|---|---|---|
| نووسراوی پایەبەرز بۆ باڵیۆزخانەی عوسمانی لە تەهران<br>چوار ساڵ لەمەوبەر چەند دزێك چوونەتە خانەی مۆسیۆ نانین پزیشکی کەرەنتینەی خانەقین سەر بە بەغداد، کەلوپەل و پارەوپولیان دزیوە، لە بارەی دۆزینەوەی دزەکان و گەراندنەوەی کەلوپەلە دزراوەکان، لەسەر نووسراوی پاشا لەلایەن والی بەغداد دەستپێشخەری کراوە و بەم دواییەدا لە کرمانشا لەلایەن دەوڵەتی پایەبەرز هەنگاو نراوە بەڵام هیچ سوودێکی نەبووە، بۆیە پارەوپول و کەلوپەلی ناوهاتوو ئاشکرا بکرێت و بگەرێندرێتەوە، بۆ ئەم مەبەستەش نووسراوی ١٥ زیلقەعدە ١٢٧٧ دراوەتە باڵیۆزی عوسمانی، بەڵام تا ئەم کاتە هیچ شتێك دەرنەکەوتووە، بە راگەیاندنی لە نەزارەتی کاروباری تەندروستی ئەمجارە بۆ بابی عالی دووپاتکراوەتەوە، بە گوێرەی ئاماژەی پێشوو کارەکە چارەسەر بکرێت. | | |




HR.MKT.00508.00073.002

<table>
<tr><td>HR.MKT</td><td>00508.00073</td><td>28 رەبیعی یەکەم 1281/ 31 ئاب 1864</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ پایەی والآی نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار<br>ڕاگەیەندراوی بەندەمانە<br>تا ٢٠ ڕۆژی تر درێژکردنەوەی هێلی تەلەگرافی تەهران تا خانەقین کۆتایی دێت، بۆ ئەم مەبەستەش گفتوگۆ دەستی پێکردووە، باڵیۆزخانەی عوسمانی لەگەڵ بەغداد و بابی عالی پەیوەندی بە تەلەگراف کراوە، لە بارەی تێچووی ئەم کارە بە بریار و ڕاگەیاندنی جەنابی پەیوەندیداری نەزارەت، بۆ چارەسەرکردنی و تۆمار کردنی شیفرەی تەلەگرافنامەکان بە ئاشکرا ڕەوانەکردنەکە ئەنجام بدرێت، لەم بابەتەدا فەرمان و بریار بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بەدەستەوەیە.<br>مەسڵەحەتگوزاری تەهران</td></tr>
</table>




HR.MKT.00511.00067.001

| HR.MKT | 00511.00067 | 8 شەوال 1281/ 6 مارت 1865 |
|---|---|---|
| نووسراوی سەدری ئەعزەم بۆ کارگێری تەلەگراف<br>تەلەگرافی خانەقین بۆ ماوەی ١٠ رۆژ کاری نەکردووە، بۆ ئەم مەبەستە زوهدی بەگ بەرێوەبەری تەلەگرافی خانەقین دوور خراوەتەوە، بۆ روون کردنەوەی پاکانەی ئەستۆ، لەگەڵ ئێرانیش گفتوگۆ کراوە، دروستە ناوبراو وەکو جاران لە ئەرکەکەی بەردەوام بێت، لەلایەن جەنابی پاشای والی بەغداد تەلەگرافنامە هاتووە و هاوپێچ رەوان کراوە، بە تێروانین لە راستی بابەتەکە نووسراو لەلایەن والی ناوهاتوو هاتووە کە پێویستە ئاماژەی پێ بکرێت. | | |




A.}MKT.MHM.00343.00059.1.001

| A.MKT.MHM | 00343.00059 | 18 جەمادی یەکەم 1282/ 9 تشرینی یەکەم 1865 |
|---|---|---|

بۆ لایەنی والای قائیمقامیەت

لە نێو فەرمانگەی لەشکری شەشەمی هومایۆن ئەمرۆ لە قائیمقامیەتەکانی شارەزوور، موسڵ، خانەقین، مەندەلی و خۆراسان، چوار بلۆکی رەدیف بناغەی سەربازیان داگیر کردووە، لەگەڵ ئەوەی ئەم سەربازانە ماوەی دیاریکراوی ئەرکی سەربازیان تەواو کردوە، بەڵام چوونەتە نێو سەربازانی رەدیف، بۆ ئەم مەبەستە دووبارە چوار بلۆك رێك بخرێتەوە و بکرێتە هەشت بلۆك و ئەفسەری وەکو یوزباشی و چاوش دابمەزرێنن، ئەم هەشت بلۆکەش وەکو یەك تابور، قۆڵئاغای راست عوسمان ئاغا لە تابووری یەکەمی سەر بە ئالای یەکەمی لەشکری ناوهاتوو بە بینباشی جێگیر بکرێت، بۆ ئەم مەبەستەش لەسەر ئاماژەی والا دوای رەزامەندی بە فەرمانی جەنابی پاشا فەرموویەتی، فەرمانی عالیش بۆ سەروو بەرز کراوەتەوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.




A.}MKT.MHM.00378.00011.001

<table>
<tr><td>24 زیلقەعدە 1283/ 30 مارت 1867</td><td>00378.00011</td><td>A.MKT.MHM</td></tr>
<tr><td colspan="3">لە وەکیلی بەغداد بۆ لایەنی سەدری ئەعزەم<br>بۆ گۆرینی هەندێك لە فەرمانبەرانی ئەیالەتی بەغداد، ئەو مووچەی کە سەر لە نوێ و بە زیادکردن بۆیان دابین کراوە برەکەی ١٩,٨٠٠ قوروش دەبێت، ئەمانە لە کۆن ١٥,٩٢٥ قوروش مووچەیان بۆ دابین کراوە بە موازەنە ئەوەی ئێستا رێکخراوە ٣,٩٥٠ قوروش بە کراوەیی ماوەتەوە، بە گوێرەی نیزامی خەرج کردن، پێویستی بە رەزامەندییە، بە دۆزینەوەی سەرچاوەی پارەکەش ناوە دیاریکراوەکان لە بەرێوەبەرایەتی قەزای سەنجەقەکانی بەسرا، عەمارە، خۆراسان و خانەقین لە مێژووی هەڵبژاردنیان ئەرکەکەیان پەسەند بکرێت بۆ ئەم مەبەستە بە بریاری ئەنجوومەنی واڵا و بە فەرمانی پاشای جەنابی پاشا رەزامەندی دراوە کارەکە حەواڵەی نەزارەتی دارایی شکۆدار کراوە.</td></tr>
</table>




| HR.MKT | 00591.00050 | 14 جەمادی کۆتایی 1284/ 13 تشرینی یەکەم 1876 |
|---|---|---|
| نووسراوی سەدری ئەعزەم بۆ کارگێری تەلەگراف<br>بۆ دروست کردنی هێلی تەلەگرافی نێوان بەغداد و خانەقین، لە هیندستان پێداویستی هێنراوە، بۆ ئەم مەبەستەش برەکەی دیاریکراوە و لەگەڵ باڵیۆزی ئینگلتەرا لە بەغداد لەلایەن فەرمانبەرانی تەلەگراف دەفتەر رێکخراوە و رەوان کراوە، ئەمجارە لەلایەن والی بەغدادیش نووسراو هاتووە، ئەو دەفتەرانەی ناویان هاتووە بە هاوپێچ پێشکەش کراوە، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە. | | |




HR.MKT.00607.00002.003

| HR.MKT | 00607.00002 | 2 زیلقەعدە 1284/ 25 شوبات 1868 |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار<br>نەفەراتی ئێرانی لەلای خانەقین سەرپێچیان کردووە، بۆ ئەم مەبەستە تەلەگرافنامە لە مێژووی ١١ شوبات ١٢٨٣ بۆ پاشا بەرز کراوەتەوە، لە بارەی ناوبراوان ئەوانەی دەستگیرکراون لە ٢٣ رەمەزان ١٢٨٤ رادەستی شەهبەندەرخانە کراوە، پوختەکەی بە پۆستە راگەیەندراوە.<br>محەمەد نامق | | |



HR.MKT.00607.00002.001

| 29 زیلقەعدە 1284/ 23 مارت 1868 | 00607.00002 | HR.MKT |
|---|---|---|

نووسراوی پایەبەرز بۆ مەسڵەحەتگوزاری تەهران
ئـەو سـەربازانەی ئێـران کـە هێرشـیان کردۆتـە سـەر خانەقیـن لەلایـەن والـی بەغـداد دەسـتگیرکراوە و دەسـت بەسـەرکراون، لـە بەرامبـەر ئـەم هەڵوێسـتەی دەوڵـەت لەلایـەن دەوڵەتـی ئێرانـەوە سـکاڵا لـە ٦ شـەوال ١٢٨٤ ژمـارە ٩٩ هاتـووە و خوێندنـەوەی بـۆ کـراوە، لـە بـارەی سـکاڵای باڵیۆزخانـەی ئێـران بـە تەلەگـراف لەگـەڵ والـی بەغـداد گفتوگـۆ کـراوە، لـە ئەنجـام ناوبـراوان رادەسـتی کارپـەردازی ئێـران کـراون.




HR.MKT.00633.00096.001

| 12 رەجەب 1285/ 29 تشرینی یەکەم 1868 | 00633.00096 | HR.MKT |
|---|---|---|

نووسراوی پایەبەرز بۆ باڵیۆزخانەی عوسمانی لە تەهران

٨ سەربازی ئێرانی بە بیانووی چاودێری کردنی دز، سنووریان بەزاندوە و تا قۆناغی حکوومەتی خانەقین هاتوون، لەسەر ئاماژەی پێشوو لە سەر ئاگاداری وەزیری کاروباری دەرەوەش، دوای وەرگرتنی رەزامەندی دەبێ ناوبراوان تەمبێ بکرێن و ئەم جۆرە بارودۆخانە دووبارە نەبێتەوە، بۆ ئەم مەبەستەش ئامۆژگاری و رێنمایی پێویست بدرێتە فەرمانبەرانی سەر سنوور، لەسەر گشت ووتەکان نووسراوی ٦ موحەرەم ١٢٨٥ ژمارە ٣٥ ی باڵیۆز بە هەژمار و وەڵامەوە هاتووە و خوێندنەوەی بۆ کراوە.




HR.MKT.00614.00061.002

| HR.MKT | 00614.00061 | 1 سەفەر 1285/ 24 مایس 1868 |
| --- | --- | --- |
| لەلایەن کارگێری تەلەگراف راپۆرتی وەرگێردراوی لە مێژووی ٣١ مارت ١٨٦٨ دراوەتە پایەی نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار لەوەتەی هێڵی نێوان هیندستان و ئەوروپا درێژکراوەتەوە، لە ناوچەی فاو یەکەی قەڵەمی پەیوەندی تێکەڵاو کاری کردووە، وەکو ئەمە لە مەرکەزی تەلەگرافی حاجی قەرەی خانەقین یەکەی قەڵەمێك بکرێتەوە، بۆ سوودەکەشی راپۆرتی باڵیۆزخانەی ئینگلتەرا رەوان کراوەتەوە، بەرێوەبەری تەلەگرافی ئێران داوای کردووە لە حاجی قەرە یەکەی قەڵەمی تێکەڵاو دروست بکرێت، راپۆرتەکە لەگەڵ راپۆرتی فەرمانبەرانی تەلەگرافی هیند بەستراوەتەوە، بە تێروتەسەل تۆمار کراوە، دوای تێروانین لە بابەتەکە سوودی راپۆرتی ناوهاتوو راگەیەندراوە، دوای جێبەجێ کردنی کارەکە لە حاجی قەرە تا سنووری ئێران بە رووبەری ٢ کاتژمێر هێڵی تەلەگرافی دەوڵەتی عالی دادەمەزرێت، هەروەکو جاران بخرێتە ژێر چاودێری تەلەگرافخانەی دەوڵەت، بە راگەیاندنی پەلە کراوە، لەم بابەتەدا لە هەر حالەتێکدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بەدەستەوەیە. | | |




HR.MKT.00682.00017.003

| HR.MKT | 00682.00017 | 2 زيلحيجه 1286/ 5 مارت 1870 |
|---|---|---|

وێنەی تەلەگرافنامەی پاشا بۆ ویلایەتی بەغدادی شکۆدار

٧٠ چەکداری ئێران لە گوندی تەوێڵە و شارۆچکەی بنگودەی خانەقینی سەر سنووری ئێران سەرپێچیان کردووە، تەلەگرافنامەی ١٨ شوبات وەرگیراوە، هەرچی زووە لەلایەن باڵیۆزخانەی ئێران تەلەگرافنامە بۆ نەزارەتی دەرەوەی ئێران و کارپەردازی بەغداد ڕەوان کراوە و ئاگاداریان پێ دراوە، بۆ جێگیر کردنی ئاسایش بە عالی ڕاگەیەندراوە.

تلغرافنامه





HR.MKT.00681.00061.002

<table dir="rtl">
<tr><th>HR.MKT</th><th>00681.00061</th><th>1 زیلحیجه 1286 /4 مارت 1870</th></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ پایەی شکۆداری پایەبەرزی سەدارەت<br>عەشیرەتی سنجابی ئێران هاتوونەتە کوێستانی خانەقین، دواتر ٥٠ سوارەی ئەم عەشیرەتە پێش دوو ڕۆژ هێرشیان کردۆتە سەر گوندی کشلول سەر بە ناحیەی قەرەتەپە، لە دانیشتوان ٤ نەفەریان بردووە و ئاژەڵ و مەڕوماڵاتی گوندنشینیان تاڵان کردووە، هەروەها چەند جار ئەم عەشیرەتە تەلی تەلەگرافیان پچراندووە، بۆ پاراستنی خانەقین و دەورووبەری، بێجگە لەم سەرباز و زەبتیەی لەوێیە، ئەمجارە تابورێکی پیادە و نیوەی ئاڵای سوارە نێردراوە.<br>مدحەت</td></tr>
</table>

تلغرافنامە



A.}MKT.UM.01115.00028.001

<table>
<tr><td>A.MKT.UM</td><td>01115.00028</td><td>20 شەعبان 1287/ 15 تشرینی دووەم 1870</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ پایەی سەدارەتی پایەبەرز<br>لەبەر ئەوەی خانەقین تەنیا ۱۰۰۰ نەفەر هەڵدەگرێت، بۆیە بە پێویست زانراوە كەرەنتینخانە دروست بكرێت، بۆ خەرجی دروست كردنی كەرەنتینەكەش ۳ یوك قوروش دابین دەكرێت، چونكە ئەگەر ئەم خانەیەی كە بۆ كەرەنتینە بە كرێ دەگیرێت بە پارەكەی خانەیەك بكردرێت، ئەوا نیوەی خەرجی، بەڵكو زیاتریش بۆ دەوڵەت دەگەرێتەوە، بۆ ساڵی داهاتوو لە وەرزی كۆلێرا یەكەم شت كە پێویستە ئەنجام بدرێت بینایەكەیەتی.<br>مدحەت</td></tr>
</table>




A.}MKT.UM.01115.00028.002

| A.MKT.UM | 01115.00028 | 26 شەعبان 1287/ 21 تشرینی دووەم 1870 |
| --- | --- | --- |
| تەلەگرافنامەی سەدری ئەعزەم بۆ ویلایەتی بەغداد<br>لە تەلەگرافنامەی ٣ تشرینی دووەم ١٢٨٦ ئاماژەی پێکراوە، ئەم خانەیەی لە خانەقین بۆ کەرەنتینە ئامادە دەکرێت، بە نیوەی خەرجی بە زیادەوەش حاڵی حازر خانەیەکی پێ دەکردرێت، ئەگەر داهاتی هەشت یەکی رێك بخرێت، ئەوا دەست دەکرێت بە دروست کردنی خانەی کەرەنتینە، پێویستە لەگەڵ نەخشەکەی دەفتەری خەرجیش رەوان بکرێت. | | |


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
A.} MKT.UM
1115 | 55

A.}MKT.UM.01115.00055.001

| A.MKT.UM | 01115.00055 | 29 شەعبان 1287/ 24 تشرینی دووەم 1870 |
|---|---|---|
| تەلەگرافنامەی پاشا بۆ ویلایەتی بەغداد<br>جەنابی شا لەگەڵ دایکی گەیشتونەتە خانەقین، هەم لەلای خۆی هەم لەلای دایکیەوە سوپاسی جەنابی سوڵتان کراوە، لەگەڵ جەنابی کەمال پاشا بە هاوبەشی تەلەگرافنامەیان رەوان کردووە، سوپاسگوزاری خۆیان بە دەوڵەتی عوسمانی راگەیاندووە. | | |

HR.MKT.00707.00094.002

| HR.MKT | 00707.00094 | 23 زیلقەعدە 1287 /14 شوبات 1871 |
|---|---|---|

بۆ پایەی پایەبەرزی سەدارەتی شکۆدار
فرقەیەکی هەمەوەند کە لەلایەن سلێمانی دەرچووە، هاتوونەتە نێوان خانەقین و چیای شەهربان، کەلوپەلی سەرکاری موقاتەعە عەبدولغەفور ئاغایان تاڵان کردووە، دواتریش بە فیشەك لێیان داوە و کوشتوویانە، هەروەها ئەوەی هاتۆتە پێشیان لە کچ و کوڕی ناوبراو و پزیشکی کەرەنتینەی خانەقین تاڵانیان کردووە، هەر چەندە سەرباز چوونەتە سەریان و تا سەر سنوور چاودێری کراون، بەڵام گشتی چوونەتە لای حاکمی زەهاب و رزگاریان بووە، ئەمە بۆ نازم ئەفەندی نووسراوە.





| HR.MKT | 00695.00077 | 3 رەجەب 1287/ 29 ئەيلوول 1870 |
| --- | --- | --- |
| وێنەی نووسراوی سەدری ئەعزەم و نووسراوەکانە کە لە سەرەتای سەفەر ١٢٨٥ و ١١ مایس ١٢٨٤ بۆ ویلایەتی بەغداد و وەکالەتی نەزارەتی تەلەگراف نووسراوەتەوە هێڵی تەلەگرافی هیندستان لەوەتەی درێژ کراوەتەوە وەکو یەکەی قەڵەمی پەیوەندی تێکەڵاو، لە مەرکەزی تەلەگرافی حاجی قەرەی خانەقین یەکەی قەڵەمێکی تێکەڵاو دروست بکرێت، هەرچی سوود و باشی ئەم کارەیە ئاماژەی پێکراوە، بەڵام لە ناوچەی ناوهاتوو تا سنووری ئێران ماوەی ١٢ کاتژمێر هێڵی تەلەگراف لە ناو دەوڵەتی عوسمانی بوونی هەیە، لەلایەن دەوڵەتی عوسمانیەوە رێك دەخرێت هەروەکو پێشتر تەلەگرافخانەی دەوڵەت لە ژێر نەزارەت دەمێنێتەوە، بۆ دامەزراندنی قەڵەمی ناوهاتووش بە وەکالەتی نەزارەتی تەلەگراف راگەیەندراوە، بۆ ئەوەی دامەزراندنی ئەم قەڵەمە سەربگرێت، هێڵی سنوور لە لایەنەکەی تر گۆرانکاری تێدا نەکرێت و بەردەوام رێك بخرێت. | | |




HR.MKT.00697.00038.001

<table>
<tr><td>HR.MKT</td><td>00697.00038</td><td>18 ڕەجەب 1287 /14 تشرینی یەکەم 1870</td></tr>
<tr><td colspan="3">نووسراوی سەدری ئەعزەم بۆ نەزارەتەکانی بازرگانی و تەندرستی شکۆدار<br>٢٠٠ نەفەر لە گەشتیارانی ئێران کە لە خانەقینن، بڕیاریان داوە بچنە لای سامەڕا، بۆ ئەم مەبەستەش سەرباز و زەبتیە ڕەوانەی شوێنەکە کراوە و کەرەنتینە کردنیان لەسەر جێبەجێ کردنە، هەروەها ئەو ٢٠ گەشتیارەی بۆ لای نبگدرە هەڵاتوون، دەستگیر کراون و هێنراونەتەوە خانەقین، لەم ١٠٠ نەفەرەش کە هێرشیان کردۆتە سەر فەرمانبەر و گاردیانەکان، لە کاتی پارێزگاری بە زانیاری سەربازی نیزامیە بێ دەنگ کراون، ئەمجارە لەلایەن ویلایەتی بەغدادی شکۆدار تەلەگرافنامە هاتووە و وێنەیەکی بۆ لایەنی پاشا ڕەوان کراوە.</td></tr>
</table>




A.}MKT.UM.01126.00048.001

| A.MKT.UM. | 01126.00048 | 25 جەمادی یەکەم 1288/ 12 ئاب 1871 |
|---|---|---|
| تەلەگرافنامەی سەدری ئەعزەم بۆ ویلایەتەکانی دیاربەکر و حەلەب و سوریە نەخۆشی کۆلێرا لەلایەنی ئێران هەبووە، بەم دواییەش لە بەسرا و خانەقین و کەرکووك سەری هەڵداوە و لە کەربەلا و سلێمانیش بەردەوامە، ئاوا بروات لە هەموو عیراق بڵاودەبێتەوە، بۆ قەدەغەکردنی لە بڵاوبوونەوەی لە ویلایەتەکانی دیاربەکر و سوریە، لەلایەنی عیراق کەرەنتینە دانراوە، ئەوانەی لەوێ دێن ۱۰ رۆژ کەرەنتینە بکرێن، لە نەزارەتی تەندروستی بۆ لایەنی والآ و ویلایەتە ناوهاتووەکان راگەیەندراوە هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی. | | |




HR.MKT.00724.00006.002

| HR.MKT | 00724.00006 | 17 رەمەزان 1288/ 30 تشرینی دووەم 1871 |
| --- | --- | --- |

٤٥
بۆ جەنابی پەیوەندیداری وەکالەتی پاشا
راگەیەندراوی بەندەمانە
کاتێك عەشیرەتی سنجاوی لە خاکی ئێران دێنە ئەم لایەنە، لەلایەنی خانەقین کەرەنتینە ناکرێن و تێدەپەرن، ئەمەش دەبێتە نموونەیەکی خراپ بوو گەشتیارانی دیکە، ئەم کارەش بە رێککەوتنی نێوان قائیمقامی خانەقین و فەرمانبەرانی ئێران کراوە، دوای مۆڵەت دەبێ ئێرانیەکان کەرەنتینە بکرێن، ئەمجار تەلەگرافنامە بە زمانی ئیتالی لە کەرەنتینەی بەغداد وەرگیراوە و وێنەیەکی بۆ سەروو بەرز کراوەتەوە، لەسەر فەرمانی پەیوەندیداری وەکالەت هاوپێچ پێشکەش کراوە، بە تێروانین لە بابەتەکە کارەکە هەر ئێستا جێبەجێ بکرێت، بۆ ئەم مەبەستەش فەرمان بە تەلەگراف بە ویلایەتی بەغداد راگەیەندراوە، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بە دەستەوەیە.






A.}MKT.UM.01174.00050.001

| 16 سەفەر 1289/ 25 نیسان 1872 | 01174.00050 | A.MKT.UM. |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار
هۆبەی مەکتوبی دەرەوە
تەلەگرافنامەی پاشای ویلایەتی بەغداد
٩ نیسـانی ١٢٨٨ وەڵامـی تەلەگرافنامەتانـە، داواکـراوە حاکمـی زەهـاب مەلیـك نیـاز خـان لەسـەر ئەنجامدانـی مامەڵـەی سـەیر لـە خانەقیـن، سـزا بدرێـت، تابوورێـك ئامادەکـراوە و بـۆ شـارۆچکەی ناوبـراو رەوان کـراوە، لەگـەڵ پاراسـتنی ئاسـایش تـەواوکاری کارەکـە، پێویسـتە فەرمانبـەران ئـاگادار بکرێنـەوە لـە کێشـە خۆیـان بپارێـزن.




A.}MKT.UM.01259.00051.001

| A.MKT.UM | 01259.00051 | 7 سەفەر 1290/ 6 نیسان 1873 |
| --- | --- | --- |

تەلەگرافنامە بۆ ویلایەتی بەغداد

موقاتەعەکانی سەید حەسەن و بەگسایی و غەریبە سەر بە دەوڵەتن، بە شێوەی ئیلتیزام بەڕێوەببردرێت، هەروەها لە خانەقین تا حەوێز بە دروست کردنی منارەی چاودێری تابووری سنوور بڵاوبکرێتەوە، بۆ ئەم مەبەستەش لە مێژووەکانی ١٢ و ٢٢ شوبات ١٢٨٨ و ١١ مارت ١٢٨٩ سێ تەلەگرافنامە وەرگیراوە، لە بریکارەکانی تایبەت خوێندنەوەی بۆ کراوە، لە بابەتە ڕاگەیەندراوەکان بابەتی منارە ئاماژەی پێکراوە و هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.



A.}MKT.MHM.00450.00042.001

<table>
<tr><td>21 موحەررەم 1290/ 21 مارت 1873</td><td>00450.00042</td><td>A.MKT.MHM</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ موشیرەتی زەبتیە و نەزارەتی دارایی شکۆدار<br>بەهۆی کارە باشەکانی ئاغای بلۆکی شەشەم حەمید زوبێر ئاغا لە تابووری یەکەم سەر بە ئاڵای زەبتیەی ویلایەتی بەغداد لە قەزای خانەقین، وەکو پاداشت لە پلەی پێنجەم یەك پارچە نیشانی مەجیدی پێ دەدرێت، لەم بارەیەوە لەسەر ئاماژەی والا جەنابی پاشا بە فەرمانی پاشا رەزامەندی نیشان داوە، کاری نیشانی ناوهاتوو حەواڵەی نەزارەتی دارایی شکۆدار کراوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.<br><br>بۆ دارایی<br>هەواڵ و زانیاری جێبەجێ کردنی دراوە، لە ١٨ موحەررەم ١٢٩٠ داواکراوە جێبەجێ بکرێت.</td></tr>
</table>




HR.MKT.00787.00020.001

| HR.MKT | 00787.00020 | 26 رەبیعی یەکەم 1290/ 24 مایس 1873 |
|---|---|---|
| تەلەگرافنامەی پاشا بۆ وەکالەتی والی بەغداد<br>وەڵامی تەلەگرافنامەی مێژووی ٦ مایس، ١٠ نەفەر لەگەڵ ئۆنباشی ئێران ملکەچی خۆیان بۆ منارەی سنووری خانەقین راگەیاندووە، هەر چەندە ئێرانیەکان لەلای ئێمە ئەرکیان پێ نادرێت، بەڵام ئەوانە لە شوێنی نزیك سنوور بەکار بهێنرێن، بە وەرگرتنی ملکەچ بوونیان، بگوازرێنەوە بۆ ئەم شوێنانەی بۆیان دیاری کراوە و لەوێ وەکو سەرباز دەست بە کار بن. | | |



HR.MKT.00789.00081.001

| HR.MKT | 00789.00081 | 16 ڕەبیعی کۆتایی 1290/ 13 حوزەیران 1873 |
|---|---|---|

نووسراو بۆ باڵیۆزخانەی ئێران
هەر لە کۆنەوە بە درێژایی سنوور عەشیرەتەکانی ئێران زەرەروزیان بە خانەقین، حەوێزە و بەسرای سەر بە ویلایەتی بەغداد دەگەیەنن، بۆ قەدەغەکردنی ئەم جموجوڵانە نزیکەی ٦٠ منارەی چاودێری دروست بکرێت و بە پێی پێویست پارێزگار لە منارەکان دابنرێن، بۆ ئەم مەبەستەش نووسراو بۆ ویلایەتی بەغداد ڕەوان کراوە، پێشەکی ئەم منارانە لە سلێمانی تا خانەقین دروست دەکرێن، چونکە بۆ بەرقەرار بوونی ئاسایش تاوەکو ئێستا لەسەر سنووری خانەقین و حەوێزە لەم جۆرە خاڵانە پارێزگار دانەمەزراوە، لە ئەنجام عەشیرەتەکان بە نەبوونی پاسەوان زیان بە ناوچەکە دەگەیەنن، بۆیە گرنگ و پێویستە لە خاڵەکاندا پارێزگار دابنرێت، زەوی هەیە ماوەیەکی زۆرە لە نێوان دەوڵەتی عوسمانی و دەوڵەتەکانی دراوسێ ناکۆکی هەیە، بۆیە منارەکان لەم زەوییانە دروست بکرێت کە ناکۆکی لەسەر نییە، بە شێوەیەکی کاتی بۆ پاراستنی ناوچەکەش لە ئەنجومەنی وەکیلەکان نووسراو کراوە، پاشاش بە فەرمانی پاشا ڕەزامەندی نیشان داوە، ئەم کارەش جێگەی خۆشحاڵی وڵاتانی دراوسێ دەبێت، بە ڕاگەیاندنی نووسراو کراوە.



HR.MKT.00835.00044.001

| 17 ڕەبیعی کۆتایی 1291/ 3 حوزەیران 1874 | 00835.00044 | HR.MKT HR.MKT |
|---|---|---|

نووسراوی سەدری ئەعزەم بۆ نەزارەتی نافیعە
لە خانەقین تا بەندەر عەباس لە کەنداوی بەسرا ڕێگایەکی ئاسنی دروست دەکرێت، بۆ ئەم مەبەستەش نییەت هەیە ئەم پێشنیارە بدرێتە دەوڵەتی ئێران، هەروەها لە نێوان ئەوروپا هیندستان ڕێگایەکی لەم شێوەیە نییە، بەم کارەش بە گشتی دەوڵەتی عوسمانی لەگەڵ ئینگلتەرا و ئەوروپا سوودمەند دەبن، لەلایەن وەکیلی بارون روترك پێداچوونەوە بۆ کارەکە کراوە، لە بارەی ئەم بابەتە خوێندنەوەی لایەنەکان کراوە و داوای ڕەزامەندی کراوە تاوەکو لە کاتی جێبەجێ کردنی کارەکە ئاگاداری پێویست بدرێتە دەوڵەتی ناوهاتوو، هەر ئێستا نووسراو لە باڵیۆزخانەی عوسمانی لە تەهران بۆ نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار هاتووە، هاوپێچەکەی ڕەوان کراوە و بە خوێندنەوەی ئاماژەی دەوڵەت و نووسراوی ناوهاتوو ڕەوان بکرێتەوە.




HR.MKT.00841.00075.004

<table dir="rtl">
<tr><th>HR.MKT</th><th>00841.00075</th><th>1 جەمادی یەکەم 1291/ 16 حوزەیران 1874</th></tr>
<tr><td colspan="3">ژمارە ٥٠<br>نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>ئـەم هێڵـە تەلەگرافـەی لـە تەهـران بـۆ خانەقیـن درێـژ دەبێتـەوە، لـە مانگـی ٨-٩ وە بـە تەواوەتـی لـە کار کەوتـووە، مانـەوەی بـەم شـێوەیە پێچەوانـەی ئـەم ڕێککەوتنـە تەلەگرافیەیـە کـە لـە نێوان دەوڵەتـی عوسـمانی و دەوڵەتـی ئێـران کـراوە، بـە ڕاپـۆرت داوام کـردووە چـاك بکرێتـەوە و پارێـزگاری لـێ بکرێـت، دوای ئەمـەش چەنـد جارێـك ئاگاداریـم پـێ داون و دووپاتـم کردۆتـەوە، بـەڵام بـە بـێ دەنگـی کات بەفیـرۆ دەدەن، لەسـەر دوا چەخـت کردنـەوەم پێـش دوو ڕۆژ وەڵامنامـە هاتـووە و ڕاگەیەنـدراوە گوایـە هێڵـی ناوهاتـوو چـاك کراوەتـەوە و دەسـتی بـە کار کـردووە، بـەڵام کـە پرسـیار لـە تەلەگرافخانـە کـراوە، زانیومانـە زۆر بەکەمـی کار دەکات، بـە نـووسراو ڕاگەیەنـدراوە لەلایـەن حکوومـەت بـۆ چاکسـازی دەستپێشـغەری کـراوە، لـەم بابەتـەدا بڕیـار و فەرمان بـۆ جەنابـی ئـەم کەسـەیە کـە فەرمانـی بـە دەسـتەوەیە.</td></tr>
</table>



| 29 رەجەب 1291/ 11 ئەیلوول 1874 | 00848.00052 | HR.MKT |
|---|---|---|
| نووسراوی سەدری ئەعزەم بۆ نەزارەتی تەلەگراف و پۆستە<br>لە بارەی چاککردنەوە و پاراستنی هێڵی تەلەگرافی نێوان تەهران و خانەقین، لەلایەن دەوڵەتی ئێران دەستپێشخەری پێویست کراوە و ئاماژەی باڵیۆزی عوسمانی لە تەهران لە مێژووی ٢ جەمادی کۆتایی ١٢٩١ بە دەرسەعادەت ڕاگەیەندراوە، ئەمجارە لە باڵیۆزخانەی ناوهاتوو نووسراوی هاتوو بە هاوپێچ ڕەوان کراوە، لە خوێندنەوەی نووسراوەکە سوود وەرگیراوە و لە بارەی ئەم بابەتەدا دووبارە ئاگاداری دەرچووە، لەلایەن وەزیری کاروباری دەرەوە پەیمان و دڵنیاییکردنەوە دراوە، بڕیاریش دراوەتە نازری تەلەگراف، لەم حاڵەدا چاوەڕێ کردن هیچ سوودێکی نابێت، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی کارەکە. | | |





HR.MKT.00855.00072.001

<table>
<tr><td>8 شەوال 1291 /18 تشرینی دووەم 1874</td><td>00855.00072</td><td>HR.MKT</td></tr>
<tr><td colspan="3">نووسراوی پایەبەرز بۆ باڵیۆزخانەی عوسمانی لە تەهران<br>بەهۆی پرسەوە، گەشتیارە ئێرانیەکانیان بردۆتە خانەقین تا بگوازرێنەوە بۆ عەتەباتی عالیە، بەڵام سکاڵا لەسەر فەرمانبەران بەرز کراوەتەوە، کەچی ئەم سکاڵایانە هیچ راستی و دروستییەکی تێدا نییە، رێگە نەدرێت هیچ سکاڵایەك هەبێت، لە خانەی کەرەنتینەی بەغداد داوای زانیاری کراوە، لە نەزارەتی بازرگانی شکۆدار ئاماژەی پێکراوە و لە مێژووی ٢١ نیسان ١٢٩١ یش وەڵام بەرز کراوەتەوە، ئەم زانیاریەی لە خانەی کەرەنتینەی باسکراو داوا کراوە، وەڵامەکەی بە تەلەگرافنامە وەرگیراوە، ئەمجارە بە نووسراو لە نەزارەتی ناوهاتوو رەوان کراوە، وێنەیەکی بۆ هاوپێچ بەرز کراوەتەوە، لە فەرمانگەی ئاماژە بوونی هەیە.</td></tr>
</table>


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
HR.MKT
844 | 28

HR.MKT.00844.00028.001

| HR.MKT | 00844.00028 | 1 رەجەب 1291/ 14 ئاب 1874 |
|---|---|---|

تەلەگرافنامەی پاشا بۆ ویلایەتی بەغداد
مێژووی ٢٤ حوزەیران ١٢٩٠ وەڵامی تەلەگرافنامەکەتانە، بۆ پاراستنی گەشتیاران تابوور و تۆپ رەوانی خانەقین کراوە، بۆ ئەمەش شەهبەندەری ئێران پرسیاری کردووە و وەڵامدراوەتەوە، لەلایەن ئێران تۆپ رەوانی قەڵای موتاوە کراوە، دوای پرسیاری باڵیۆزخانە، وەڵام هاتووە، بەڵام ناردنی سەرباز و تۆپ بۆ لایەنی خانەقین و نەناردنی بۆ سنووری سلێمانی راست نییە، دوو پارچە تەلەگرافنامە لە وەزیری کاروباری دەرەوە وەرگیراوە، وێنەیەکی رەوانی باڵیۆزخانە کراوە، راستی و دروستی ئەم بابەتە لە تەلەگرافنامەی ١٣ تەمموز ١٢٩٠ روون کراوەتەوە، ئێستا پێویستە بزانرێت لەلای ئێمەوە پێویستە چ ئامادەکاری و دەستپێشخەری بکرێت، بۆ ئەمەش لێکۆڵینەوە و ووردبینی تەواو بکرێت و ئەنجامەکەی ئاماژەی پێ بکرێت.




تلغرافنامه

مكتوب كوندرن مركزك تاريخى ساعت دقيقه ٦ كوندز كيجه

عدد كلمات ٨٠

مكتوب كوندرن مركز نومروسى ٤١٠٧

بغداد مركزندن ... مركزنه

مكتوب اخذينه مباشرت اولندىغى ساعت دقيقه ٧ ٤٠ كوندز كيجه

مكتوب تكميل اولندىغى ساعت دقيقه ٧ ٥٩ كوندز كيجه

... واسطه‌سيله اخذ قلندىغى

مكتوب آلان مأمورك امضاسى

مركزيلش مأمور ...ك امضاسى

مركزه وصول تاريخيله نومروسى

مكتوبك محلنه ايصالى ... يوم ... ساعت دقيقه ٦ ١٥ كوندز كيجه

مأمور سوق مكاتيب



A.}MKT.UM.01378.00050.002

| A.MKT.UM | 01378.00050 | 27 ڕەبیعی یەکەم 1292/ 3 مایس 1875 |
|---|---|---|

مابەینی هومایۆن

جێگای سەرسورمانە دەروێش ئەفەندی دوای وەرگرتنی ژمێریاری ئەوقافی بەغداد، بۆ پاراستنی مولکەکانی لە خانەقین داوای کردووە کەسوکارەکانی لە قائیمقامیەتی خانەقین دامەزرێت، کە لە کەرکووك نیشتەجێن، لە فەرمانگەی والی پاشا کاغەزێکی بەرز کردۆتەوە و لە نیوەی موحەررەم دەستم بەسەر داگرتووە و بە راگەیاندنی کاغەزەکە، ووتوومە ئەگەر ناوبراو لە خانەقین بەبری ١٠٠٠ کیسە رووبار و مولکی نەبێت و ئەوانەی داوای دامەزراندنیان دەکات کەسوکاری نەبن، ئەوا بە دانی پارە رازیم، ئەگەر وەکو کاغەزەکەش بێت داوای میهرەبانی و ویژدان دەکەم.





A.}MKT.UM.01391.00040.001

| A.MKT.UM | 01391.00040 | 29 جەمادی یەکەم 1292/ 3 تەمموز 1875 |
|---|---|---|
| بۆ ویلایەتی بەغدادی شکۆدار<br>بەهۆی جیابوونەوەی لە نائیبی خانەقین، مەعروف ئەفەندی بە واژووی خۆی تەلەگرافنامەیەکی لە مەرکەزی بەغداد رەوان کردووە و تێدا مەغدوری خۆی نیشان داوە، بە تێروانین لە ناوەرۆکی بابەتەکە لێکۆڵینەوە ئەنجام بدرێت و راستی و دروستی بابەتەکە بە گوێرەی ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە زانیارییەکان رابگەیەندرێت. | | |

HR.MKT.00898.00016.001

| HR.MKT | 00898.00016 | 19 شەوال 1292/ 18 تشرینی دووەم 1875 |
|---|---|---|
| وەڵامنامەی راوێژکار بۆ باڵیۆزخانەی تەهران<br>بەشێکی هێڵی تەلەگرافی خانەقین تا کرمانشا نۆژەنکراوەتەوە، ئەوەی ماوەتەوە دەستپێشخەری کراوە بۆ چاککردنەوەی، نووسراوی مێژووی ١٢ رەمەزان ١٢٩٢ ژمارە ١٣٩ رەوانی نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار کراوە، بەندەمان خوێندنەوەی بۆ نەکردووە و بە راگەیاندنی وەڵامنامە هەژمار بکرێت. | | |





HR.MKT.00883.00077.001

<table>
<tr><td>HR.MKT</td><td>00883.00077</td><td>10 جەمادی کۆتایی 1292/ 14 تەمموز 1875</td></tr>
<tr><td colspan="3">وەڵامنامەی پایەبەرزی باڵیۆزخانەی تەهران<br>لە بارەی هێڵی تەلەگرافی تەهران-خانەقین، ماوەی دوو ساڵە ئەو دەستپێشخەریە یەك لە دوای یەکانەدا کراوە، لەلایەن باڵیۆزەکان دانیشتن و بیمە وەرگیراوە، بەڵام هیچ سوودێکی نەبینراوە، ئەو راپۆرتەی لە بارەی ئەم بابەتە هاتووە، تا ئێستا لە وەڵامنامەدا پاکانەی ئەستۆی بۆ نەکراوە، لە نووسراوی مێژووی ٤ جەمادی یەکەم ١٢٩٢ ژمارە ٦٨ خوێندنەوە و نووسراوی بۆ کراوە، لە راستییدا ئەم بابەتە لەسەر ئاگاداری یەك لە دوای یەکی باڵیۆز، هێڵی ناوهاتوو چاکسازی بۆ کراوە و بەم تێروانینە دوای مۆڵەت هەر چەندە چەختکراوەتەوە، بەڵام ئەوەی پێویستە بەدەست نەکەوتووە، ئیتر ئەم کارە لەمە زیاتر قوڵ نەبێتەوە بە راگەیاندنی وەڵامنامە.</td></tr>
</table>



HR.MKT.00881.00093.002

| HR.MKT | 00881.00093 | 10 جەمادی یەکەم 1292/ 14 حوزەیران 1875 |
|---|---|---|
| بابی فەتوا<br>۱۹<br>بۆ لایەنی پاشای جەنابی پەیوەندیداری وەکالەت<br>راگەیەندراوی بەندەمانە<br>لە مەرکەزی خانەقین داواکاری بە واژووی محەمەد ساڵح بە تەلەگرافنامەیەك دەرچووە، دەدرێتە جەنابی پاشا لە پەیوەندیداری وەکالەت، بە تێروانین لە بابەتەکە کارەکە جێبەجێ بکرێت، بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بە دەستەوەیە | | |




HR.MKT.00871.00075.001

| HR.MKT | 00871.00075 | 23 سەفەر 1292/ 31 مارت 1875 |
|---|---|---|

وەڵامنامەی پایەبەرز بۆ باڵیۆزخانەی عوسمانی لە تەهران

بـۆ چاککردنـەوەی هێڵـی تەلەگرافـی تەهران-خانەقیـن ئـاگاداری هاتـووە، بـۆ ئـەم مەبەسـتە بەڵێـن و پەیـمان دراوە بـۆ چاککردنـەوەی دەستپێشـخەری دەکرێـت، لەسـەر نـووسراوی مێـژووی ٢٦ جەمـادی کۆتایـی ١٢٩١ ژمـارە ١٠٠ لەگـەڵ نەزارەتـی تەلەگـراف گفتوگـۆ کـراوە، بـۆ چۆنیەتـی کارەکـەش پـرس بـە پشـکێنەری بەغـداد کـراوە، لەلایـەن فەرمانبـەر و کارگێـری تەلەگرافـی ئێرانیـش داوای روون کردنـەوە کراوە،ئێرانیشـەوە داوای روون کردنـەوە کـراوە، دوای وەرگرتنـی وەڵامـی نـەزارەت، بـە پشـکێنەر رادەگەیەندرێـت تیمێـك لـە قـەسری شـیرین تـا ئـالان بـروات، دووبـارە بـە ناردنـی ئـاگاداری پێویسـت و وەرگرتنـی وەڵام هیممـەت بکرێـت لـە کۆتایـی هێنـان بـە کارەکـە.



HR.MKT.00885.00082.001

| 19 جەمادی کۆتایی 1293/ 12 تەمموز 1876 | 00885.00082 | HR.MKT |
|---|---|---|

نووسراوی سەدری ئەعزەم بۆ رسوماتی ئەمانەت

هەر لە کۆنەوە ئەم کەلوپەلانەی لە ئێرانەوە دێت، لە سنوور پشکنینی بۆ دەکرێت و وەکو گومرگ رسومات وەردەگیرێت، لە شوباتی رابردوو رۆژی ٢٧ و ٢٨ و ٢٩ لە گومرگی خانەقین ئەوەی لە رسوماتی توتن (نێرگەلە) وەرگیراوە، بەڵام رەسمی گومرگی مانگی مارت بە بریاری مقاوەلەنامەی نوێ سەدا ٧٥ وەرگیراوە، دوای مۆڵەتیش لە دەوڵەتی ناوهاتوو داواکراوە ئەم توتنەی (نێرگەلە) دێت رسوماتەکەی لە بەغداد وەردەگیرێت، لەم بابەتەدا وەکو پێشوو مامەڵەکان ئەنجام بدرێن و رسوماتی توتن (نێرگەلە)ی باسکراویش وەردەگیرێت، بە تێروانین لە بابەتەکە لێکۆڵینەوەی پێویست ئەنجام بدرێت، لەگەڵ ئاماژەی دەوڵەت هیممەت بکرێت و نووسراو بکرێت.

HR.MKT.00995.00099.001

| HR.MKT | 00995.00099 | 26 شەوال 1294/ 3 تشرینی دووەم 1877 |
|---|---|---|

تەلەگرافنامەی پاشا بۆ ویلایەتی بەغداد
لە ئێران کەلوپەل دەکردرێت و لە کاتی هێنانی بۆ خانەقین و کازمیە گومرگ وەردەگیرێت، بۆ وەرگرتنی ئەم گومرگ و رسوماتەش بە لێکۆڵینەوە لەم بابەتەدا ئاماژەی پێ بکرێت.




HR.MKT.00973.00009.001

| 28 جەمادی یەکەم 1294/ 10 حوزەیران 1877 | 00973.00009 | HR.MKT |
|---|---|---|

تەلەگرافنامەی پایەبەرز بۆ مەسڵەحەتگوزاری تەهران
وەڵامی تەلەگرافنامەی مێژووی ٦ حوزەیران ١٨٧٧، تابوورێکی سەربازی کە لە خانەقین جێگیرە، بۆیە هەرگیز گونجاو نییە سەر لە نوێ سەرباز و تۆپ رەوانی ناوچەکە بکرێت، بە ئاماژەی ویلایەتی بەغداد پێویستە چۆنیەتی کارەکە بە وەزارەتی دەرەوە رابگەیەندرێت.



HR.MKT.00993.00071.001

<table>
<tr><td>HR.MKT</td><td>00993.00071</td><td>10 شەوال 1294/ 18 تشرینی یەکەم 1877</td></tr>
<tr><td colspan="3">تەلەگرافنامەی پاشا بۆ ویلایەتی بەغداد<br>لەلایەن وەکیلی قائیمقامی خانەقین بینباشی ئەحمەد ئەفەندی زوڵم لە گەشتیارانی ئێران کراوە و نزیکەی ٧٠ گەشتیاری ناوهاتوو، کە گەیشتوونەتە خانەقین، وتوویانە هاووڵاتی رووسین و بۆ لایەنی ئێران دەرکراون، ئاخۆ هاووڵاتی رووسین یاخود نا، پرس بە باڵیۆزخانە بکرێت، هەروەها ئەفەندی ناوهاتوو بە چ جۆرێك بە وەکالەت لە قائیمقامیەت دامەزراوە، ئاماژەی پێ بکرێت.</td></tr>
</table>




HR.MKT.00994.00063.001

| 19 شەوال 1294/ 27 تشرینی یەکەم 1877 | 00994.00063 | **HR.MKT** |
|---|---|---|

نووسراوی سەدری ئەعزەم بۆ رسوماتی ئەمانەتی شکۆدار
فەرمانبەرانی رسوماتی خانەقین و کازمیە مامەڵەی خراپ لەگەڵ گەشتیارانی ئێران ئەنجام دەدەن، سکاڵا و نووسراوی مێژووی ١٢ شەوال ١٢٩٤ بۆ سەروو بەرز کراوەتەوە، لەسەر ئاماژەی پێشوو ئەم زانیارییەی لەسەر ئەم بابەتەدا هەیە، هەرچی زووە کۆتایی پێ بهێنرێت، بۆ جێبەجێ کردنی کارەکەش نووسراو کراوە.



HR.MKT.00999.00091.001

| HR.MKT | 00999.00091 | 21 زیلقەعدە 1294/ 27 تشرینی دووەم 1877 |
|---|---|---|
| نووسراوی سەدری ئەعزەم بۆ نەزارەتی دارایی<br>لەلایەن گەشتیارانی ئێران سکاڵا لەسەر فەرمانبەرانی رسوماتی خانەقین و کازمیە بەرز کراوەتەوە، لەبارەی ئەم بابەتەدا پەیوەندی بە رسوماتی ئەمانەت کراوە، نووسراو و وێنەیەکی کاغەزی جێبەجێ کردنی دیوانی هومایۆن بە هاوپێچ بۆ سەروو بەرز کراوەتەوە، ئەم بابەتانەی پەیوەستن بە رسومات، بۆیە پرس بە ئەمانەتی ناوهاتوو کراوە، لە کاغەزی ناوهاتوودا لەگەڵ خەزینەی شکۆدار داواکراوە جێبەجێ بکرێت و بەپەلە ئاماژەی پێ بکرێت. | | |



| ملفوفات | نوع مسوده | مکتوبی خارجیه | مهمه مدیری | سرخلیفه | مسوده | تاریخ | نومرو |
|---|---|---|---|---|---|---|---|



HR.MKT.00999.00094.001

<table>
<tr><th>HR.MKT</th><th>00999.00094</th><th>23 زیلقەعدە 1294/ 29 تشرینی دووەم 1877</th></tr>
<tr><td colspan="3">نووسراوی سەدری ئەعزەم بۆ رسوماتی ئەمانەتی شکۆدار<br>گەشتیارانی ئێران لە دژی فەرمانبەرانی رسوماتی خانەقین و کازمیە سکاڵایان بەرز کردۆتەوە، لە بارەی بابەتەکە نووسراو کراوە، لە مێژووی ٤ زیلقەعدە ١٢٩٤ وەڵام هاتووە، دەرکەوتووە لە گەشتیارانی ناوهاتوو پێچەوانەی یاسا و نیزام گومرگ وەرگیراوە، ئەم کارەش کاریگەری لەسەر ئەمانەتی شکۆدار دەبێ، بۆ چۆنیەتی کارەکە پرس بە قەڵەمی دیوانی هومایۆن کراوە، ئاماژەی پێکراوە لە کەلوپەلی بازرگانی ئێرانی سەدا ٤ رەسمی گومرگ وەردەگیرێت، جگە لەمە وەکو بازرگانی دەوڵەتی پایەبەرز مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت، بە بڕیارەکانی رێککەوتننامەی ئەرزروم، هاوپێچەکەی بەرز کراوەتەوە، بەم دواییەش داواکاریەکان لە باڵیۆزخانەی ئێران دەرچووە، ئەمجارە هاوپێچ دراوە و ئەم بابەتانەی سکاڵایان لەسەر بەرز کراوەتەوە، لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکرێت و بەپەلە ئاماژەی پێ بکرێت.</td></tr>
</table>

HR.MKT.00993.00071.002

| HR.MKT | 00993.00071 | 28 ڕەمەزان 1294/ 6 تشرینی یەکەم 1877 |
|---|---|---|

بۆ باڵیۆزخانەی ئێران لە ئیستەنبۆڵ
لەلایەن فەرمانبەری خانەقین تەلەگرافنامە یەك لە دوای یەك هاتووە، لە ناوەڕۆکی بابەتەکەدا هاتووە، قائیمقامی وەکیل بینباشی ئەحمەد ئەفەندی دووبارە لە بەرامبەر ئێرانیەکان سەرپێچی کردووە، بە هاتنی ٧٠ نێر و مێی گەشتیاری ئێرانی بۆ خانەقین لێکۆڵینەوە کراوە، دەرکەوتووە ئەمانە ئێرانی نین بەڵکو هاووڵاتی رووسین، بە زۆری بۆ ئێران دوورخراونەتەوە، هەروەها ئەمانە ناسنامەی تەبریز و ئەردەبیلی ئێرانیان هەیە، بۆیە ئاساییە دەوڵەت ئەمانە ڕەوانی ئێرانیان بکاتەوە.




باب عالی

نظارت جلیلهٔ خارجیه



HR.MKT.00973.00009.002

| HR.MKT | 00973.00009 | 29 جەمادی یەکەم 1294 /11 حوزەیران 1877 |
| --- | --- | --- |

بابی عالی

نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار

هۆبەی مەکتوبی دەرەوە

تەلەگرافی مێژووی ٦ حوزەیران ١٨٧٧ ژمارە ٣١ لە مەسڵەحەتگوزاری ئێران بۆ پایەی نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار رەوان کراوە

لـە وەزیـری کاروبـاری دەرەوە ٢٠ تـۆپ و سـەرباز لـە سلێمانی بـۆ خانەقیـن رەوان کـردووە، پرسیار لە هـۆکاری ئەم کارەش کـراوە، لـە وەڵامـدا راگەیەنـدراوە لەلایـەن خۆیانـەوە هێشـتا سـەرباز رەوانـی سـنوور دەکـەن، هەروەهـا ئـەم شـوێنانەی ناکۆکـی لەسـەرە، لەلایـەن ویلایەتـی بەغـدادەوە منـارەی چاودێـری دروسـت دەکرێـت، بـە پروپاگەنـدەی ئێرانیـش حەواڵـە کـراوە، بـەڵام بـە زەبـری هێـز دروسـت کردنـی وەسـتێنراوە، بـۆ ئەمـەش فەرمـان دراوەتـە فەرمانبەرانـی ئێـران، بـە راپـۆرت بـە باڵیۆزخانـە راگەیەنـدراوە، وەڵامـی تەلەگرافنامـەی ژمـارە ٢٩ نەرمـی نەنوانـدووە، بابـی عالـی لـەم بارەیـەوە رای خـۆی هەیـە و پرسـیاری کـردووە، هەروەهـا مافـی خـۆی دەوێـت، نـازم ئەفەنـدی هێشـتا نەچۆتـە سـەر ئەرکەکـەی، تـکا دەکـەم بـە تەلەگـراف فەرمـان بنێردرێـت، لـە دوێنێـوە ٤ نەفـەر یەکێکیـان جەنەراڵـە و ئەوانـی تـر ئەفسـەری رووسـین گەیشـتوونەتە تەهـران.




HR.MKT.01019.00045.005

<table dir="rtl">
<tr><th>HR.MKT</th><th>01019.00045</th><th>7 زیلقەعدە 1294/ 13 تشرینی دووەم 1877</th></tr>
<tr><td colspan="3">ژمارە ١٢٣<br>بۆ نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>لەلایەن بەرێوەبەری پۆستەخانەی دەوڵەتی ئێرانی نووسراو بۆ باڵیۆزخانەی عوسمانی کراوە، وێنەیەکی بە هاوپێچ پێشکەش کراوە، لە بابەتەکە روون بۆتەوە دەوڵەتی ئێران ماوەیەك چۆتە نێو یەکێتی گشتی، حاڵی حازر لە نێوان بەغداد و خانەقین و کرمانشا تەنیا بە گواستنەوەی نووسراو تایبەت کراوە، بۆیە ئارەزوو کراوە هێڵێك درێژ بکرێتەوە، چۆنیەتی لەلایەن بەرێوەبەری ناوهاتوو ٤ مانگ پێشەکی بە نووسراو ئاماژە دراوەتە نەزارەتی پۆستەی سەروو، بەڵام هێشتا وەڵام نەدراوەتەوە، لەم بارەیەوە لە باڵیۆزی عوسمانی پێداچوونە کراوە، ئەنجامەکەشی دەدرێتە بەرێوەبەرایەتی ناوهاتوو، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە بریاری بەدەستەوەیە.<br>مۆری ئیسماعیل زەید مەسڵەحەتگوزاری تەهران</td></tr>
</table>



HR.MKT.00964.00011.001

| HR.MKT | 00964.00011 | 9 ڕەبیعی کۆتایی 1294/ 23 نیسان 1877 |
|---|---|---|

نووسراوی پاشا بۆ ویلایەتی سوریا
لـە ئەسـڵدا مـەکاری شـوکری دانیشـتووی خانەقیـن و هاووڵاتـی دەوڵەتـی عوسـمانیە، ماوەیەکـی زۆرە لـە قـودس و شـام نیشـتەجێ بـووە، ماوەیەکـی پێـش ئێسـتا ڕێـگای گرتۆتەبـەر و گەیشـتۆتە خـوێ، هاوەڵانـی کـە هەڵاتـووی سـەربازین لەلایـەن ئێرانیەکانـەوە هـەواڵ دراوەتـە شـەهبەندەری دەوڵەتـی عوسـمانی ناوبراویـش لەگەڵیـان دەسـتگیر کـراوە و ئەگەرچـی پروپاگەنـدە کـراوە کـە ناوبـراو هەڵاتـووی سـەربازی نییـە و دانیشـتووی کرمانشـا و هاووڵاتـی ئێرانـە، هەروەهـا لەلایـەن کارپـەردازی شـام پاسـەپۆرتی پێـدراوە، بـەڵام لەلایـەن داواکاری باڵیۆزخانـەی عوسـمانی بـە پارێـزراوی هێنراوەتـە تەهـران، ژێردەسـتەیی و پاسەپۆرتەکەشـی لـە ڕێگـەی فریودانـی لەلایـەن ئێرانیەکانـەوە وەرگرتـووە، هەڵاتنـی لـە سـەربازی پشتراسـت نەکراوەتـەوە، لـە باڵیۆزخانـەی عوسـمانی لـە تەهـران بـە نـووسراو ئامـاژەی پێکـراوە پاسەپۆرتەکەشـی بـە پۆسـتە بـۆی ڕەوان کـراوە، لـەوێ لـە ڕێگـەی لێکۆڵینـەوە ڕوون دەبێتـەوە و بـە گوێـرەی ئەنجامەکـەی پێویسـتە مامەڵەکـەی جێبەجـێ بکرێـت، بـۆ وەرگرتنـی ئامـۆژگاری پێویسـتیش نـووسراو لـە نەزارەتـی دەرەوەی شـکۆدار بـۆ باڵیۆزخانـەی ئێران نێردراوە.


OSMANLI ARŞİVİ
HR.MKT
1041 | 88

HR.MKT.01041.00088.001

| HR.MKT | 01041.00088 | 24 رەمەزان 1295/ 21 ئەیلوول 1878 |
|---|---|---|
| نووسراوی سەدری ئەعزەم بۆ رسوماتی ئەمانەت نووسراوەتەوە ئـەم بابەتانـەی لەسـەر فەرمانبەرانـی رسـومات لـە بـارەی گەشـتیارانی ئێرانـی لای خانەقیـن و کازمیـە هەیـە، نـووسراوی ٢٩ رەبیعـی یەکـەم ١٢٩٥ لەگـەڵ وەڵامەکـەی بەیەکـەوە بـەرز کراوەتـەوە، لەبـارەی بەپەلـە کۆتایـی هێنـان بـە بابەتەکـە و ئاماژەکـەی هیممـەت بکرێـت. | | |



HR.MKT.01034.00096.001

| 4 شەعبان 1295 /1 ئەیلوول 1878 | 01034.00096 | HR.MKT |
|---|---|---|
| تەلەگرافنامەی پاشا بۆ ویلایەتی بەغداد<br>ئـەم بـارەی کۆمپانیـای لینـج لـە ئێـران هێناویەتـی، لەبـەر ئـەوەی پێچەوانـەی نیزامیـە، لـە گومرگـی خانەقیـن دەسـتی بەسـەردا گیـراوە، بـۆ تێپەڕاندنـی بارەکـە و وەرگرتنـی مۆڵـەت داواکاری دراوەتـە باڵیۆزخانـە، بـۆ مامەڵـەی پێویسـت لێکۆڵینـەوە ئەنجـام بدرێـت و ئامـاژەی پـێ بکرێـت. | | |




HR.MKT.01049.00007.001

| HR.MKT | 01049.00007 | 19 زیلقەعدە 1295/ 14 تشرینی دووەم 1878 |
|---|---|---|
| تەلەگرافنامەی پاشا بۆ ویلایەتی بەغداد<br>بەهــۆی هێرشــی چەتــە و تــاڵان، ئەمنیەتــی نێــوان بەغــداد و خانەقیــن ســەقامگیر نییــە، لــە باڵیۆزخانــەی تەهــران ئامــاژەی پێکــراوە، کار بکرێــت بــۆ ئامــادەکاری بەپەلــە و جێگیــر کردنــی ئاســایش. | | |




| نومرو | تاریخ | مسود | سرخلفه | مهمه مدیری | مکتوبی خارجیه | نوع مسوده | ملفوفات |
|---|---|---|---|---|---|---|---|



HR.MKT.01012.00066.001

<table>
<tr><td>HR.MKT</td><td>01012.00066</td><td>9 رەبیعی یەکەم 1295/ 13 مارت 1878</td></tr>
<tr><td colspan="3">نووسراوی پایەبەرز بۆ رسوماتی ئەمانەت<br>لەلایەن گەشتیارانی ئێرانی سکاڵا لەسەر فەرمانبەرانی رسوماتی خانەقین و کازمیە بەرز کراوەتەوە، لەسەر ئەم بابەتانە نووسراو لە مێژووی ٢٣ رەبیعی یەکەم ١٢٩٤ دراوەتە دیوانی هومایۆن، لە ٥ موحەررەم ١٢٩٥ دووپاتکراوەتەوە، تا ئێستا وەڵام نەدراوەتەوە، لەسەر ئاماژەی پێشووی بەپەلە ئاماژە تایبەت بەم بابەتە لە واڵا دەربچێت.</td></tr>
</table>



| ملفوفات | نوع مسوده | مکتوبی خواجه | مهمه مدیری | سرخلیفه | مسوده | تاریخ | نومرو |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

OSMANLI ARŞİVİ
HR.MKT
1019 | 45 | 1

HR.MKT.01019.00045.001

<table>
<tr><td>19 ڕەبیعی کۆتایی 1295/ 22 نیسان 1878</td><td>01019.00045</td><td>HR.MKT</td></tr>
<tr><td colspan="3">نووسراوی پایەبەرز بۆ نەزارەتی پۆستە و تەلەگرافی سەروو<br>بۆ کار پێکردنی پۆستەی نێوان بەغداد و خانەقین و کرمانشا، لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە فەرمانبەری پێویست دامەزراوە، لەلایەن دەوڵەتی ئێران ئەم فەرمانبەرانی دادەمەزرێت و پێویست دەکات روو لە خانەقین بکەن، لە وەڵامی نووسراوی ١٠ سەفەر ١٢٩٥ تەلەگرافنامە بۆ باڵیۆزخانەی تەهران نووسراوە، لە وەڵامدا ئەمجارە نووسراو هاتووە، ئەم فەرمانبەرانەی لەلایەن دەوڵەتی ناوهاتوو بە چوونیان بۆ ناوچەی ناوهاتوو لەگەڵ فەرمانبەرانی ئێمە بەیەکەوە لە مانگی رومی شوبات رۆژی ٢٦ بە دواوە دەست بە کار دەکەن و بە راگەیاندنی نووسراو کراوە، فەرمان و بریاری جەنابی ئەفەندیمانە.</td></tr>
</table>



| نومرو | تاريخ | مسوده | سرخلفه | مهمه مديرى | مكتوبى خارجيه | نوع مسوده | ملفوفات |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | | | |



HR.MKT.01005.00017.001

| HR.MKT | 01005.00017 | 3 موحەرەم 1295/ 7 کانوونی دووەم 1878 |
|---|---|---|

نووسراوی سەدری ئەعزەم بۆ رسوماتی ئەمانەت
لە بارەی گەشتیارانی ئێران لەلایەن فەرمانبەرانی رسوماتی خانەقین و کازمیە سکاڵا بەرز کراوەتەوە، لەبارەی بابەتەکانی سکاڵاکە کاغەز لە قەڵەمی دیوانی همایۆن دراوە لەگەڵ کاغەزی باڵیۆزخانەی ئێران، لە وەڵام نووسراوی مێژووی ٢٣ زیلقەعدە ١٢٩٤ نووسراوەتەوە، ئەگەر بۆ لای سەروو بەرز کرابێتەوە، بەڵام تا ئێستا وەڵام نەگەراوەتەوە، هەروەها لە باڵیۆزخانەی ناوهاتووش پەلە نەکراوە، چۆنیەتی کارەکە لەسەر ئاماژەی پێشوو بەپەلە لێکۆڵینەوە و ئاماژەی پێ بکرێت.



| ملفوفات | نوع مسوده | مكتوبی خارجیه | مهر مدیری | سرخلیفه | مسود | تاریخ | نومرو |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

OSMANLI ARŞİVİ
HR.MKT
1009 47

HR.MKT.01009.00047.001

| 15 سەفەر 1295 /18 شوبات 1878 | 01009.00047 | HR.MKT |
|---|---|---|

تەلەگرافنامەی پایەبەرز بۆ مەسلەحەتگوزاری تەهران
وەڵامـی نـووسراوی ٧ زیلقەعـدە ١٢٩٤، ئـەم پۆسـتەیەی لـە نێـوان بەغـداد و خانەقیـن و کرمانشـا بریـارە دابمەزرێـت، فەرمانبـەری پێویسـت دابمەزرێـت، بـۆ ئەمـەش نـووسراو بـۆ کارگێـری پۆسـتەی تەهـران کـراوە، چاوەرێـی وەڵام دەکرێـت، لەگـەڵ نەزارەتـی تەلەگـراف و پۆسـتە پەیوەنـدی کـراوە، چۆنیەتـی کارەکـە بـە کارگێـری ناوهاتـوو ڕاگەیەنـدراوە.



HR.MKT.01049.00007.002

| 26 ڕەمەزان 1295/ 23 ئەیلوول 1878 | 01049.00007 | HR.MKT |
|---|---|---|

ژمارە ۹۷
بۆ لایەنی پایەبەرزی نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار
ڕاگەیەندراوی بەندەمانە
بە هیچ شێوەیەك لە ڕێگای نێوان بەغداد و خانەقین ئەمنیەت نەماوە، بەردەوام هێرش دەکرێتە سەر کاروانەکان کەلوپەلی بازرگانی و پارەوپولیان تالان دەکرێت و دەدزرێت، ڕۆژ بە ڕۆژیش ئەم کردەوانە ڕوو لە زیادبوونە، لە نووسراوەکانی هاتووی شەهبەندەی کرمانشا ئاماژە بەم بارودۆخە کراوە، لە ڕاستییدا ئەم بارودۆخە لەم ناوچەیەدا کاریگەری خراپ دروست دەکات، لە ڕێگای ناوهاتوو ئاسایش بەرقەرار بکرێت ئەگەرچی ئەمجارە ئامۆژگاری و ڕێنمایی دراوەتە ویلایەتی بەغدادی شکۆدار، بەڵام لە لایەنی سەروو بڕیار و فەرمان دراوەتە ویلایەتی ناوهاتوو، لە هەر حاڵەتێکدا بڕیار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بەدەستەوەیە.
مۆری فەخری باڵیۆزی تەهران

HR.MKT.01085.00017.001

| HR.MKT | 01085.00017 | 17 شەعبان 1296/ 6 ئاب 1879 |
|---|---|---|

نووسراوی پایەبەرز بۆ نەزارەتی تەلەگراف و پۆستە
لە بارەی هێڵی تەلەگرافی خانەقین پرس و خویندنەوەی میهرەبان، هێشتا وەڵامی نووسراوی مێژووی ٦ شەعبان ١٢٩٦ و ٧ شەعبان ١٢٩٦ نەهاتووە، ئەمجارە لە باڵیۆزخانەی تەهران بە تەلەگراف دووپاتکراوەتەوە، بەمەبەستی دووبارە دووپاتکردنەوە نەکرێت بەپەلە کۆتایی پێ بهێنرێت و فەرمانی ئەفەندیمانە.



HR.MKT.01096.00036.001

| 25 زیلقەعدە 1296/ 10 تشرینی دووەم 1879 | 01096.00036 | HR.MKT |
|---|---|---|

نووسراوی پایەبەرز بۆ نەزارەتی تەلەگراف و پۆستە
بۆ ئەوەی هێڵی تەلەگرافی خانەقین پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەتی ئێران ئەنجام بدرێت، بریارنامە دراوەتە قەڵەم، لەسەر نووسراوی ١٦ شەعبان ١٢٩٦ ی پەیوەندیداری نەزارەت، بریارنامەی ناوهاتوو بە نووسراو دراوەتە باڵیۆزخانەی تەهران، ئەم وەڵامەی لە باڵیۆزخانەی ناوهاتوو هاتووە، تەلەگرافنامە هاوپێچ بەرز کراوەتەوە، بە خوێندنەوەی، دەوڵەتی ئێران پێشنیاری کردووە لە دوو ماددەی بریارنامەکە بۆچوونی هەیە.

HR.MKT.01081.00034.001

| 13 رەجەب 1296 /3 تەمموز 1879 | 01081.00034 | HR.MKT |
|---|---|---|

نووسراوی پایەبەرز بۆ باڵیۆزخانەی عوسمانی لە تەهران
لـە دانیشـتوانی بەغـداد و گشـت ویلایەتەکانـی دەوروبـەر ئەوانـەی بـۆ ئێـران رایانکـردووە بـە زانیـاری پۆلیس یەك یـەك دوو دوو دەسـتگیر کـراون، لـە ژێر پاراسـتن رەوانی خانەقین دەکرێن، نـووسراوی مێژووی ٨ جەمـادی ١٢٩٦ ژمارە خوێندنـەوەی بـۆ کـراوە، کەسـانی ناوهاتـوو بـەم شـێوەیە دەسـتگیرکردن و رەوان کردنیـان جێگەی خۆشـحاڵی بووە.




HR.MKT.01083.00033.001

| HR.MKT | 01083.00033 | 24 ڕەجەب 1296/ 14 تەمموز 1879 |
| --- | --- | --- |
| نووسراوی پایەبەرز بۆ نەزارەتی پۆستە و تەلەگراف<br>پرس و رایەکان لەبارەی هێڵی تەلەگرافی خانەقین خوێندنەوەی بۆ کراوە، تا ئێستا وەڵامی نووسراوی مێژووی ٦ ڕەجەب ١٢٩٦ نەهاتووە، هێڵی ناوهاتوو نۆژەنکراوەتەوە، لە بارەی تەلەگرافی گشتی لەلایەن وەزیری کاروباری دەرەوە چاوەڕێی وەڵام دەکرێت، ئەمجارە لە باڵیۆزخانەی عوسمانی لە تەهران وێنەی تەلەگرافنامەی هاوپێچ لەگەڵ دووپاتکردنەوە دەرچووە، لەسەر ئاماژەی پێشوو بەپەلە کۆتایی بە بابەتەکە بهێنرێت. | | |



HR.MKT.01085.00017.003

| 19 شەعبان 1296/ 8 ئاب 1879 | 01085.00017 | HR.MKT |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار
هۆبەی مەکتوبی دەرەوە
ژمارە ٢
تەلەگرافنامەی مێژووی ١٣ تەمموز ١٢٧٩ ژمارە ١٨ لە باڵیۆزخانەی عوسمانی لە تەهران بۆ پایەی نەزارەت شکۆدار هاتووە لە نەزارەتی تەلەگراف زیاد لە پێویست گرنگی پێدراوە، هێلی خانەقین لەلایەن ئێرانەوە نۆژەنکراوەتەوە، لەبارەی درێژکردنەوەی هێلەکە، گشت پێناسەی تەلەگراف و گشتی بۆ ئەمەش وەزیری کاروباری دەرەوە وەڵامی دەوێت، لەسەر نووسراوی مێژووی ٤ سەفەر و ئەگەر نەزارەتی ناوهاتوو گوێرایەڵ بێت، تکا دەکەم بە تەلەگراف ئاماژەی پێ بکرێت.




HR.MKT.01066.00092.001

| HR.MKT | 01066.00092 | 4 ڕەبیعی کۆتایی 1296/ 28 مارت 1879 |
|---|---|---|

نووسراوی پایەبەرز بۆ تەلەگراف و پۆستە

لە دروست کردنی هێڵێکی تەلەگراف لە نێوان وان و تەبریز ڕووبەڕووی هەندێك كێشە بوونەتەوە، درێژکردنەوەی هێلی خانەقین سوودی زیاتر دەبێت، لەم وەڵامەی لە پایەی واڵا لە مێژووی ٤ شەعبان ١٢٩٥ هاتووە و نووسراو بۆ باڵیۆزی عوسمانی لە تەهران نووسراوەتەوە، دەستپێشخەری و ئارەزووی زۆر کراوە بۆ درێژکردنەوەی هێلی ناوهاتوو، وێنەیەکی نووسراوی پێناسەی ڕێکخراوە و ووتەی زبر و خوێندنەوەی ڕێگای وان هەروەها دروست بوونی کێشە لە کردنەوەی هێڵێك لە نێوان وان و تەبریز پێشبینی کراو بوو، ئەمجارە لە باڵیۆزخانەی ناوهاتوو وەڵامنامە بە هاوپێچەوە بۆ عالی بەرز کراوەتەوە، چاوەڕێی خوێندنەوە و ئاماژە پێکردنی دەکرێت.


OSMANLI ARŞİVİ
HR.MKT
1090 | 35

HR.MKT.01090.00035.001

| 24 شەعبان 1296/ 13 ئاب 1879 | 01090.00035 | HR.MKT |
| --- | --- | --- |

نووسراوی پایەبەرز بۆ باڵیۆزخانەی عوسمانی لە تەهران

لەسەر ئەم گفتوگۆیەی لە بارەی هێڵی تەلەگرافی خانەقین کراوە، لەلایەن نەزارەتی تەلەگرافی ئێران وەرگێردراوی رەشنووسی ناساندن رەوان کراوە، لەسەر نووسراوی باڵیۆزخانەکانی واڵا هەر یەکە لە مێژووی ٤ سەفەر ١٢٩٦ ژمارە ١٨ پەیوەندی بە نەزارەتی تەلەگراف و پۆستە کراوە و ئەمجارە ئەم وەڵامەی لە پترسبۆرغ وەرگیراوە، دەردەکەوێت ئەم پەیوەندییەی لەگەڵ هێڵی خانەقین ئەنجام دەدرێت سوودی دەبێت، هەروەها لە پەیماننامەی تەلەگراف ماددەی ١٧ رەزامەندی نیشان دراوە لە کاتی پێویست مقاوەلەنامەیەك لە نێوان دوو وواڵتی سەر سنوور ئەنجام بدرێت، لەبارەی رێککەوتنی ئەم مقاوەلەنامەیەش موختاری هەر وواڵتێك لە بارەی ئەم بابەتە لە بەرامبەر بریارنامەی پێناسە لە کارگێری تەلەگرافی ئێران دراوەتە قەڵەم، لیستی بریارنامە رێکخراوە و رەوان کراوە، لیستی ناوهاتوو لە واڵا رەوان کراوە، دوای گفتوگۆ کردن ئەنجامەکەی رابگەیەندرێت.


باب عالی

نظارت جلیلۀ خارجیه



HR.MKT.01127.00009.003

| HR.MKT | 01127.00009 | 2 شەعبان 1297/ 7 ئەیلوول 1880 |
|---|---|---|
| بابی عالی<br>نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار<br>هۆبەی مەکتوبی دەرەوە<br>ژمارە ١<br>تەلەگرافنامەی مێژووی ٢٠ مایس ١٨٨٠ ژمارە ٢ ی باڵیۆزخانەی تەهران بۆ پایەی نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار نێردراوە<br>ئەگەر هێڵی خانەقین درێژ کرابێتەوە، بەڵام لەبەر ووریا نەبوونی فەرمانبەرانی لای ئێمە، تەلەگرافنامەکان بە چەندین هەفتە دوا دەکەوێت، ئەگەر ئاوا بڕوات هێڵی ناوهاتوو ئەمنیەتی نامێنێت و دیسان بە ناچارییەوە هێڵەکانی ئینگلتەرا بەکار دەهێنێت، بەم کارەش دەوڵەت زیانی تەواوی پێ دەگات، بە پەلە تکا دەکرێت کارەکە جێبەجێ بکرێت. | | |

HR.MKT.01138.00088.001

| HR.MKT | 01138.00088 | 15 شەوال 1297/ 20 ئەیلوول 1880 |
|---|---|---|

نووسراوی پایەبەرز بۆ باڵیۆزخانەی تەهران
لـە بەغـداد کۆمپانیـای حوسـەینییە دامـەزراوە بـۆ دروسـت کردنـی ڕێگایـەك لـە بەغـدادەوە تـا کەربـەلا و نەجـەف لەگـەڵ خانەقیـن، لەسـەر ئـەم کاریگەریـەی لـە نـاو تەهـران لەسـەر بابەتەکـە هەبـووە، لـە نـووسراوی مێـژووی ٥ شـەعبان ١٢٩٧ ژمـارە ٧١ خوێندنـەوەی بـۆ کـراوە.

HR.MKT.01110.00016.001

| HR.MKT | 01110.00016 | 26 ڕەبیعی یەکەم 1297/ 8 مارت 1880 |
|---|---|---|

تەلەگرافنامەی پایەبەرز بۆ باڵیۆزخانەی تەهران
ئەمجارە هێڵی تەلەگرافی خانەقین واژوو کراوە، وا گونجاوە وێنەیەکی مقاوەلەنامەکە بۆ ویلایەتی بەغداد ڕەوان بکرێت، لە وەڵامدا رادەگەیەندرێت.


OSMANLI ARŞİVİ
HR.MKT
1123 70

HR.MKT.01123.00070.001

| HR.MKT | 01123.00070 | 9 جەمادی کۆتایی 1297/ 19 مایس 1880 |
|---|---|---|

نووسراوی پایەبەرز بۆ باڵیۆزخانەی ئێران
بەڕێوەبەری پۆستەی ئێران میرزا مەحمود لە خانەقین رایگەیاندووە خێزانەکەی هاووڵاتی عوسمانییە، بەڵام لەسەر ووتەی باڵیۆزخانە چۆنیەتی کارەکە لە ویلایەتی بەغدادی شکۆدار پرس کراوە، ئەمجارە لە وەڵامدا تەلەگرافنامە هاتووە، خێزانەکەی ناوبراو ئێرانی نییە و ئەم کچەی کە دەوترێت خێزانیەتی لەگەڵ باوکی بەیەکەوە لە کەرکووك هاتۆتە خانەقین و لەگەڵ مەحمود خەریکی هاوسەرگیرییە، ئەم کارەش بۆتە هۆکاری هەڵغەڵەتاندنی حکوومەتی ناوەخۆ، لەسەر هەواڵ و سکاڵا، نابێت و قەدەغەیە ئافرەتی عوسمانی لەگەڵ پیاوی ئێرانی هاوسەرگیری بکات، هەر چەندە بە خودی خۆی ووتراوە، بەڵام گوێرایەڵی سکاڵاکان نەبوون و بە زۆری لە خانەکەی داناوە و هێرشی کردۆتە سەر ناموسی، بە زانینی حکوومەت رادەستی باوکی کراوەتەوە، بۆ دەرخستنی راستییەکان نووسراو کراوە.

HR.MKT.01120.00097.001

| HR.MKT | 01120.00097 | 15 جەمادی کۆتایی 1297/ 25 مایس 1880 |
|---|---|---|
| نووسراوی پایەبەرز بۆ نەزارەتی تەلەگراف و پۆستەی پایەبەرز<br>هێڵی خانەقین درێژکراوەتەوە، بەڵام بەهۆی وووریانەبوونی فەرمانبەرانی ئێمە، چەندین هەفتە تێدەپەڕێت و تەلەگرافنامە دوادەکەوێت، لەسەر هەندێك ووتە تەلەگرافنامە لە باڵیۆزخانەی تەهران بە هاوپێچ بەرز کراوەتەوە، دواى لێکۆڵینەوە بەپەلە جێبەجێ بکرێت و کۆتایی پێ بهێنرێت. | | |



| ملفوفات | نوع مسوده | مکتوبی خارجیه | مهر مدیری | سرخلیفه | مسود | تاریخ | نومرو |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | | | | | | | ٥٥ |

OSMANLI ARŞİVİ
HR.MKT
1100 | 17 | 1

HR.MKT.01100.00017.001

| 3 موحەڕرەم 1297/ 17 کانوونی یەکەم 1879 | 01100.00017 | HR.MKT |
|---|---|---|

تەلەگرافنامەی پایەبەرز بۆ باڵیۆزخانەی عوسمانی لە تەهران

وەڵامــی تەلەگرافنامــەی مێــژووی ٤ تشرینــی دووەم ١٢٧٩، لــە شــوێن خــۆی هێڵــی تەلەگرافــی خانەقیــن تەلەگرافنامــەکان هەڵوەشــاندراوەتەوە، کرێــی ئــەم تەلەگرافنامانــەش لــە لیســت دەرهاتــووە و پەیوەســتە بــە مەرکــەز، واتــە ئەوانــەی لــە دەوڵەتــی ئێــران نووسراونەتــەوە، ئــەوەی لــەلای ئێمــەش نووسراونەتــەوە، مانــەوەی لــە مەرکەزەکانــی ئێمــە گونجــاو نییــە، هــەر یەکــە لــە مەرکــەزی خۆیــدا بــە گوێــرەی بابەتەکــە و مقاوەلەکــە بــە ڕەزامەنــدی هــەردوو لا دیــاری بکرێــت و گۆرانــکاری تێــدا بکرێــت، حاڵــی حــازر بــۆ ٣ ســاڵ ڕێککەوتــن بکرێــت، لەســەر ئاماژەی نەزارەتــی تەلەگــراف ڕێنمایــی دەکرێــت.

2 vrk
(2 shf boş)

HR.MKT.01114.00086.001

| HR.MKT | 01114.00086 | 3 جەمادی یەکەم 1297/ 13 نیسان 1880 |
| --- | --- | --- |

تەلەگرافنامەی پایەبەرز بۆ ویلایەتی بەغداد
میرزا مەحمود بەڕێوەبەری پۆستەی خانەقین-ئیران، ڕایگەیاندووە خێزانەکەی ئێرانیە، بەڵام لە ڕاستییدا هاووڵاتی عوسمانیە، بە زۆری لە خانەکەی دەرهێنراوە و ڕادەستی باوکی کراوەتەوە، لە باڵیۆزخانەی ئێران باسکراوە، لەگەڵ کارپەردازی ئێران بەیەکەوە لێکۆڵینەوە ئەنجام بدرێت، ئەگەر خێزانی ناوبراو بەڕاستی ئێرانی بێت لە بارەی ڕادەست کردنی بەپەلە ئاماژەی پێ بکرێت.



HR.MKT.01127.00009.001

| 27 رەجەب 1297/ 5 تەمموز 1880 | 01127.00009 | HR.MKT |
|---|---|---|

نووسراوی پایەبەرز بۆ باڵیۆزخانەی عوسمانی لە تەهران
لەبەر بێ وورییایی فەرمانبەرانی تەلەگرافی خانەقین، تەلەگراف بە هەفتە دوادەکەوێت، لەسەر تەلەگرافنامەی مێژووی ٢٠ مایس ١٨٨٠ ی باڵیۆزی والا، هەروەها پەیوەندی کردن بە نەزارەتی تەلەگراف و پۆستەی پایەبەرز وێنەی گشت نووسراوەکان هاوپێچ نێردراوە.




HR.MKT.01106.00100.002

<table>
<tr><td>HR. MKT</td><td>01106.00100</td><td>29 سەفەر 1297/ 11 شوبات 1880</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار<br>هۆبەی مەکتوبی دەرەوە<br>تەلەگرافنامەی مێژووی ٤ سەفەر ١٢٨٠ ژمارە ٧٨ ی باڵیۆزخانەی تەهران بۆ پایەی نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار نێردراوە<br>وەڵامی تەلەگرافنامەی ٢١ کانوونی دووەم ١٢٧٩، پێشەکی و کۆتا ڕێنمایی فەرمانگەی شکۆدار هاتووە، کە مقاوەلەنامەی تەلەگرافی خانەقین ڕێکخراوە و واژوو کراوە، بەڵام لەبەر نەبوونی ئەمنیەت ٢٠ ڕۆژی تر دەست بە کار دەبێت و لەگەڵ پۆستەی باڵیۆزخانەی ئینگلتەرا پێشکەش دەکرێت، بریارەکانی مقاوەلەنامە لە سەرەتایی نیسان جێبەجێ دەکرێت، بە گوێرەی زانیاری ئەگەر گونجاو بێت کۆپیەیەکی بۆ ویلایەتی بەغداد ڕەوان بکرێت، ڕەزامەندییەکان پێویستیان بە فەرمانە.</td></tr>
</table>


HR.MKT.01112.00060.001

| 16 ڕەبیعی کۆتایی 1297/ 28 مارت 1880 | 01112.00060 | HR.MKT |
|---|---|---|
| نووسراوی پایەبەرز بۆ نەزارەتی تەلەگراف<br>لە بارەی هێڵی تەلەگرافی خانەقین لەگەڵ دەوڵەتی ئێران مقاوەلەنامە ڕێکخراوە و واژوو کراوە، ئەمجارە وێنەی پەسەند کراو بە نووسراو لە باڵیۆزخانەی عوسمانی تەهران ڕەوان کراوە، لەلایەن دەوڵەتەوە ئەم تەلەگرافنامانەی دەردەچێت گشتی بە هێڵی ناوهاتوو دێت و دەروات، بە رای ئێمەش ئەگەر ئەم کارە جێبەجێ بکرێت سوودی بۆ ئێمە دەبێت، لە نووسراوی ناوهاتووش ئاماژەی پێکراوە کە پێویستە ئەم هێڵە لەلای ئێمە بە وورياييەوە بخرێتە ئەمنیەت و پارێزگاری لێ بکرێت، لەم بابەتەدا ئەوەی هەیە لە ئامادەکاری ئەنجام بدرێت. | | |


تلغرافنامه

OSMANLI ARŞİVİ
HR.MKT
1129 | 29 | 2

HR.MKT.01129.00029.002

| 13 شەعبان 1297 /21 تەمموز 1880 | 01129.00029 | HR.MKT |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار<br>لە ٣١ مارت ١٢٩٦، میرزا مەحمود فەرمانبەری پۆستەی خانەقین-ئێران پروپاگەندەی ئەوە دەکات خێزانەکەی ئێرانی نییە، لە راستییدا هێشتا خێزانیشی نییە، بە فێڵ و غەش لەگەڵ باوکی لە کەرکووك چۆتە خانەقین، کچێکی هاووڵاتی عوسمانی هەڵغەڵەتاندووە تا ژیانی هاوسەری پێك بهێنێت، لە ناوەخۆ سکاڵا و هەواڵ دراوەتە حکوومەت، ئەوەی جێگەی باسکردنە بە شێوەیەکی فەرمی لە حکوومەت قەدەغەکراوە هاووڵاتی عوسمانی کچ بداتە ئێرانیەکان، دوای ئەوەی کچەکە لەگەڵی نەڕۆیشتووە، ناوبراو بە زۆری بردویەتیە خانەکەی، دووبارە لە ناوەخۆ سکاڵای لەسەر بەرز کراوەتەوە، حکوومەت کچەکەی رادەستی باوکی کردۆتەوە.<br>عەبدولرەحمان | | |



| ملفوفات | نوع مسوده | مکتوبی خارجیه | مهر مدیری | سرخلیفه | مسود | تاریخ | نومرو |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

OSMANLI ARŞİVİ
HR.MKT
1106 | 100 | 1

HR.MKT.01106.00100.001

| 29 سەفەر 1297/ 11 شوبات 1880 | 01106.00100 | HR.MKT |
|---|---|---|

نووسراوی پایەبەرز بۆ نەزارەتی تەلەگراف و پۆستە
وەڵامی نووسراوی ٤ سەفەر ١٢٩٧، مقاوەلەنامەی هێڵی تەلەگرافی خانەقین واژوو کراوە، لەگەڵ پۆستەی ئینگلیز رەوان کراوە، لەم مقاوەلەش کۆپییەیەکی بۆ زانیاری وەرگرتن، رەوانی ویلایەتی بەغدادی شکۆدار کراوە، لەبارەی پرس کردن، تەلەگرافنامە لە باڵیۆزخانەی عوسمانی لە تەهران وەرگیراوە و وێنەیەکی هاوپێچ رەوان کراوە، یەکسەر جێبەجێ بکرێت و ئاماژەی پێ بکرێت.



| نومرو | تاریخ | مسود | سرخلیفه | مهر مدیری | مکتوبی خارجیه | نوع مسوده | ملفوفات |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | [illegible] | [illegible] | [illegible] | [illegible] | [illegible] | تلغراف و پوسته نظارتنه تذکره عالیه | |



HR.MKT.01101.00029.001

| HR.MKT | 01101.00029 | 9 موحەررەم 1297/ 23 کانوونی یەکەم 1879 |
|---|---|---|

نووسراوی پایەبەرز بۆ نەزارەتی تەلەگراف و پۆستە
ئـەم مقاوەلـەی بـۆ بەسـتنەوی پەیوەنـدی دەوڵەتـی ئێـران بـە هێڵـی خانەقیـن ئامـادە کـراوە، یەکێـك لـە مەرجەکانـی ڕێککەوتنەکـە، درێژکردنەوەکـە بـۆ مـاوەی ٣ سـاڵ دەبێـت، بـۆ مەرجـە پێویسـتیەکانیش ڕەزامەنـدی لەسـەر بەکارهێنانـی هێڵـی خانەقیـن بـۆ پەیوەنـدی کـردن لەگـەڵ دەوڵەتـی ئێـران کـراوە، بـۆ ئـەم مەبەسـتەش وەڵام لـە مێـژووی ١٩ زیلحیجـە ١٢٩٦ کـراوە و بـە تەلەگـراف ئامـۆژگاری دراوەتـە باڵیۆزخانـەی عوسـمانی لـە تەهـران و هـەر بـە تەلەگرافیـش وەڵام دراوەتـەوە، خوێندنـەوەی بـۆ دەکرێـت و دەوڵەتـی ئێرانیـش ڕازی بـووە بـۆ مـاوەی ١ سـاڵ ڕێککەوتـن لەسـەر مقاوەلەنامەکـە بـکات، بـەم ئاماژە پێکردنـە بـە باڵیۆزخانـەی ناوهاتـوو ڕاگەیەنـدراوە خوێندنـەوە بـۆ بابەتەکـە دەکرێـت، بەپەلـە کارەکـە کۆتایـی پـێ بهێنرێـت.


باب عالی
نظارت جلیلۀ خارجیه


HR.MKT.01100.00017.002

| HR.MKT | 01100.00017 | 3 موحەررەم 1297/ 17 کانوونی یەکەم 1879 |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار
هۆبەی مەکتوبی دەرەوە

لە مێژووی ١١ کانوونی یەکەم ١٢٧٩ ژمارە ٦٥ تەلەگرافنامەی باڵیۆزخانەی عوسمانی لە تەهران بۆ پایەی نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار رەوان کراوە لە رووی خەرجییەوە دواکەوتنی درێژ کردنەوەی هێلی تەلەگرافی خانەقین، زیانێکی گەورەی داهاتی بۆ ئێمە دروست کردووە، کارگێری تەلەگرافی ئینگلیزیش ئاقچەیەکی زۆری قازانج کردووە، بۆ رەزامەندی دابین کردنی برە پارەیەکی کەم تا ئێستا وەڵام نەهاتووە، لە بەرامبەر وەزیری کاروباری دەرەوە تووشی شەرمەزار بووین، بۆ تەلەگرافی ناوهاتوو نەزارەتی تەلەگراف چی بفەرمووێت تکایە بە تەلەگراف ئاماژەی پێ بکرێت.




HR.MKT.01147.00049.001

| HR.MKT | 01147.00049 | 21 سەفەر 1297/ 3 شوبات 1880 |
|---|---|---|

نووسراوی پایەبەرز بۆ باڵیۆزخانەی ئێران
لە باڵیۆزخانە راگەیەندراوە خێزانی میرزا مەحمود بەڕێوەبەری پۆستەی ئێران لە خانەقین هاووڵاتی عوسمانیە، بە گوێرەی ئاماژەی ویلایەتی بەغداد، دەوڵەتی عالی لەگەڵ شەهبەندەر لێکۆڵینەوە بکرێت، بۆ ئەوەی بزانرێت بەڕێوەبەری ناوبراو کچێکی بە زۆری بردۆتە خانەکەی یاخود نەیبردووە، بۆ ئەم مەبەستە لە مێژووی ٢٥ رەجەب ١٢٩٧ ژمارە ٢٧ راپۆرتی والای باڵیۆزخانە هاتووە و لە ویلایەتی ناوهاتوو ئاماژەی پێکراوە، ئەمجارە لەم وەڵامنامەیەی هاتووە، لە ناوەخۆ روون کراوەتەوە، کە بەڕێوەبەری ناوهاتوو مارەبرینەکەی هەرگیز راست نییە، بەڵکو بە زۆری بردوویەتیە خانەکەی، لەگەڵ ئەمەش پێشتر میرزا مەحمود چۆتە ئێران و لە شوێن ئەو فەرمانبەرێکی تر لە کرمانشا هاتووە، بۆیە لێکۆڵینەوەی هاوبەش هیچ مانایەکی نابێت، لەگەڵ راگەیاندنی نووسراو کراوە.




HR.MKT.01129.00029.001

| HR.MKT | 01129.00029 | 7 شەعبان 1297/ 15 تەمموز 1880 |
|---|---|---|

نووسراوی پایەبەرز بۆ ویلایەتی بەغداد

میرزا مەحمود بەڕێوەبەری پۆستەی ئێران لە خانەقین رایگەیاندووە خێزانەکەی هاووڵاتی عوسمانیە، بەڵام کچێکی عوسمانی خێزانی نییە، بەڵکو بە زۆری کچەکەی بردۆتە خانەکەی و لەکەداری کردووە، دواتر رادەستی باوکی کراوەتەوە، لە وەڵامدا بابەتەکە بە تەلەگرافنامە لە مێژووی ١٦ نیسان ١٢٩٦ بە باڵیۆزخانەی ناوهاتوو راگەیەندراوە، راستییەکە ئەمە نییە، ئەگەر میرزا مەحمود ئارەزووی لەکەدار کردنی ناموسی ئەم کچەی بوویێت، بابەتەکە تەنیا بە رادەست کردنی تەواو نابێت، پێویستە سزا بدرێت، بەم راگەیاندنە داواکراوە چۆنیەتی کارەکە لەگەڵ کارپەردازی بەغداد لێکۆڵینەوە بکرێت.



HR.MKT.01120.00058.005

| HR.MKT | 01120.00058 | 8 رەبیعی یەکەم 1297/ 19 شوبات 1880 |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار
هۆبەی مەکتوبی دەرەوە
ژمارە ١
بۆ باڵیۆزخانەی ئێرانی پایەبەرز
جەنابی ئەرکانی شاری ئێران گەشتیارە ئێرانیەکانی لە خانەقین راگرتووە، راگەیەندراوە خانەکەشی لە بەغداد دراوەتە موزایەدە، بۆ رێگە گرتن لەم کارە لەلایەن باڵیۆزخانەی عالی بە زارەکی گفتوگۆ کراوە، چۆنیەتی کارەکەش لە ویلایەتی بەغدادی شکۆدار روون کراوەتەوە، ئەمجارە لە وەڵامدا ئەم نووسراوەی هاتووە لەلایەن شەهبەندەری بەغداد بۆ نیشتەجێ کردنی گەشتیاران لە شازادەکانی ئێران کۆچکردوو محەمەد عەلی میرزا خانەکەی لە خانەقین دەستی بەسەر داگیراوە و خراوەتە موزایەدە، داواکراوە کارەکە جێبەجێ بکرێت، لەلایەن حکوومەتی عوسمانی ئەگەری نییە بۆ ئەم جۆرە گەشتیارانە ناوچەیەك دەست بەسەر دابگرێت و بیفرۆشێت، ئەگەر لە خانەقین ئەم جۆرە خانە دەستبەسەرداگیراوانە هەبێت و سەنەدات و تۆماری هەبێت، لە وەڵامدا نووسراو بۆ شەهبەندەر کراوە، بەڵام هێشتا وەڵام وەرنەگیراوە، دواتر راگەیەندراوە شازادەی ناوهاتوو خانەی ئاوای نییە بخرێتە موزایەدەوە، بۆ ئەم مەبەستەش نووسراو کراوە ئەفەندم.

HR.MKT.01206.00037.001

| HR.MKT | 01206.00037 | 9 رەبیعی یەکەم 1299/ 29 کانوونی دووەم 1882 |
|---|---|---|

نووسراوی پایەبەرز بۆ نەزارەتی تەلەگراف و پۆستە
لەگەڵ دەوڵەتی ئێران پەیمان بەستراوە، بۆ ساڵی ١٨٨٢ گۆڕانکاری لە بڕیارەکانی مقاوەلەنامەی تەلەگرافی خانەقین بکرێت، لەلایەن وەزارەتی کاروباری دەرەوەش پێشنیار کراوە و داوای ڕێنمایی کراوە، نووسراوی باڵیۆزخانەی تەهران وەرگیراوە بە هاوپێچ پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا خوێندنەوەی بەپەلەی عالی لەگەڵ ئاماژەکردن، نووسراوی ناوهاتوو ڕەوان بکرێتەوە.




HR.MKT.01223.00096.001

| HR.MKT | 01223.00096 | 1 شەعبان 1299/ 18 حوزەیران 1882 |
|---|---|---|
| نووسراوی پایەبەرز بۆ پایەی پاشای باش وەکالەت<br>وان لە سنووری دیلمان بە هێلی ئێران لەگەڵ هێلی تەلەگرافی خانەقین دەبەسترێتەوە بە یەکتر، بۆ ئەم مەبەستەش تەلەگراف دراوەتە قەڵەم، باڵیۆزی عوسمانی لە تەهران لەگەڵ حکوومەتی ئێران بە گفتوگۆ مقاوەلەنامەکە بریاری لەسەر دراوە، بۆ واژوو کردنی داوای رەزامەندی باڵیۆزخانەی ناوهاتوو کراوە، بۆ ئەمەش نووسراوی نەزارەتی تەلەگراف و پۆستەی پایەبەرز لەگەڵ وێنەی مقاوەلەنامە بەیەکەوە پێشکەش کراوە، واژووکردنی مقاوەلەنامەی باسکراو بە فەرمانی عالی جەنابی پەیوەندیداری وەکالەت بە باڵیۆزخانەی ناوهاتوو راگەیەندراوە. | | |


HR.MKT.01207.00029.001

| 18 ڕەبیعی یەکەم 7/1299 شوبات 1882 | 01207.00029 | HR.MKT |
|---|---|---|

نووسراوی پایەبەرز بۆ ویلایەتی بەغدادی شکۆدار
لەلایەن دەوڵەتی ئێران داواکراوە یوسف خان بەگ و حاجی میرزا محەمەد عەلی بەگ و محەمەد ئیسماعیل بەگ و محەمەد حوسین بەگ و محەمەد کەریم بەگ و میرزا هادی و میرزا عەبدولوەهاب خان لە سامەرا و خانەقین و کازمیە و مەندەلی و کەربەلا و نەجەف وەکو وەکیلی شەهبەندەر دابمەزرێن، بەڵام لە هۆبەی دەوڵەتی عالیە لێکۆڵینەوەی پێویستە، لە قەڵەمی شوێنکەوتووان نووسراو بە وێنەیەکی هاوپێچ بەرز کراوەتەوە، پرسیار کراوە ئایا ناوبراوان لە شوێنکەوتووان و قەبوڵکردنی ئەرکەکەیان زوڵمیان لێ دەکرێت یان ناکرێت بەپەلە ئاماژەی پێ بکرێت.



| نومرو | تاريخ | مسود | مبيضه | محرری | مكتوبى خارجيه | نوع مسوده | ملفوفات |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١٩٢ | | | | | | | |

OSMANLI ARŞİVİ
HR.MKT
1197 | 36 | 1

HR.MKT.01197.00036.001

| HR.MKT | 01197.00036 | 9 موحەررەم 1299/ 1 کانوونی یەکەم 1881 |
|---|---|---|

نووسراوی پایەبەرز بۆ باڵیۆزخانەی ئێران
نەسیم یەهودی لەسەر رووباری نەزەر عەلی کشتوکاڵ کردووە، بۆ ئەم مەبەستە لەلایەن باڵیۆزخانەکان سکاڵا بەرز کراوەتەوە، بۆ ئەم بابەتەش لەگەڵ ویلایەتی بەغداد و نەزارەتی جەنگی شکۆدار قسە کراوە، دوای پەیوەندی کردن ئەم وەڵامەی وەرگیراوە روون بۆتەوە لە نێوان شارۆچکەکانی خانەقین و مەندەلی، زەوییەکانی نێوان چیای باغچە و رووباری نەزەر عەلی ناوهاتوو کە لە ناو موقاتەعەی کۆپر سەر بە خانەقین عەشیرەتەکانی رەبیعە و بەنی وەیس سەر بە عوربانەکانی بەغداد نیشتەجێن، بۆیە رووباری نەزەر عەلی کەوتۆتە ناو کارگێری دەوڵەتی عالی، بە راگەیاندنی نووسراو بکرێت.


OSMANLI ARŞİVİ
HR.MKT
1234 | 32 | 1

HR.MKT.01234.00032.001

| HR.MKT | 01234.00032 | 20 شەوال 1299/ 4 ئەیلوول 1882 |
|---|---|---|
| نووسراوی پایەبەرز بۆ باڵیۆزخانەی عوسمانی لە تەهران<br>میر عەلی خان برای حەیدەر قولی خان بە ٢٠ ئەسپسوارەوە سنووری عوسمانی بەزاندووە و لە شەهریانی قەزای خانەقین هێرشی کردۆتە سەر تیرێك و کەسێکی بە ناوی محەمەد ئەفەندی بریندار کردووە و تفەنگ و بارگیر و ئاژەڵەکانی تاڵان کردووە، دواتر هەڵاتووە، لەلایەن سەربازانی شاهانەوە چاودێری کراون و کەلوپەلە تاڵانکراوەکانیان گەڕاندۆتەوە، بە نووسراو لە نەزارەتی جەنگی شکۆدار ئاکاژەی پێکراوە، ئەم سەرپێچیانەی لەسەر سنوور و لە نێوان دوو دراوسێ و دوو دەوڵەت پێچەوانەی یاسایە، بوێری کەران تەمبێ بکرێن و ئەم جۆرە کارانە قەدەغە بکرێت. | | |



HR.MKT.01202.00031.001

| 12 سەفەر 1299/ 3 کانوونی دووەم 1882 | 01202.00031 | HR.MKT |
|---|---|---|

نووسراوی پایەبەرز بۆ باش وەکالەتی شکۆدار
پەیوەنـدی لەگـەڵ نەزارەتـی جەنگـی شـکۆدار بـە شـێوەیەکی گشـتگیر کـراوە، هاوپێـچ حەواڵـەی فەرمانگـەی دەرەوە کـراوە، وەڵامـی نـووسراوی جەنابـی پەیوەندیـداری وەکالـەت لـە مێـژووی ٢٧ کانوونـی یەکـەم ١٢٩٧، لـە پەراوێزەکـەی نووسراوەتـەوە، روون بۆتـەوە عەشـیرەتەکانی هـەردوولا لـە دژی یەکـتر هاتووچۆکـەران تووشـی کێشـە دەکـەن، داوا کـراوە لـە ...... تـا ئالینجـە لـە خانەقینیـش تـا قـەسری شـیرین سـەربازی شـاهانە لەگـەڵ کاروانـی گەشـتیاران هاوبەشـی رێـگا بـن، بـۆ ئەمـەش ژمـارەی سـوارەی سـەربازی شـاهانە بەشـی ئـەم خزمەتـە نـاکات، هەروەهـا ئەگـەر سـەربازی ناوهاتـوو تووشـی هێرشـی چەتـەکان بێتـەوە رووبەروویـان نەبنـەوە، ئـەم ناوچانـە پێویسـتە بابـی عالـی بـە ووریاییـەوە سـەیری بابەتەکـە بـکات، ئـەم بابەتانـەی لەلایـەن دەسـتە و دەوڵەتـەوە گفتوگـۆی لەسـەر دەکرێـت، تەلەگرافنامـە لـە باڵیۆزخانـەی عوسـمانی لـە تەهـران وەرگیـراوە و وێنـەی نـووسراوەکان پێشـکەش کـراوە.



HR.MKT.01241.00098.002

| 16 زیلحیجە 1299/ 29 تشرینی یەکەم 1882 | 01241.00098 | HR.MKT |
|---|---|---|

فەرمانگەی باش وەکالەت
قەڵەمی مەکتوب
ژمارە ١٦٦
بۆ نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
هێڵی تەلەگرافی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئێران لە کار کەوتووە، ئەم مقاوەلەنامەیەی لە بارەی تەلەگرافنامەکان رێکخراوە ماوەکەی کۆتایی هاتووە، بۆیە ئەم هێڵەی لە خانەقین تا کرمانشا بوونی هەیە بهێڵدرێتەوە، لەگەڵ ئەمەش هێڵەکانی رێگاکانی باش قەلعە و دیلمان لەگەڵ هێڵی ئێران ببەسترێتەوە بەیەکتر، لەگەڵ دوورگەکانی بەحر سفیدی دەوڵەتی عوسمانی تەلەگرافنامەکان بە شێوەیەکی بێ هاوتا کاری پێ دەکرێت، بۆ واژووکردن و کار پێکردنی ئەم مقاوەلەنامەیە و بۆ وەرگرتنی بری ئەو رسوماتەی لە هێڵەکان رێکخراوە، رەزامەندی دراوەتە باڵیۆزخانەی عوسمانی تەهران و حەواڵەی نەزارەتی شکۆدار کراوە، لەگەڵ ئەمەش ئاماژەی پێکراوە، تا زانیاری بدرێتە نەزارەتی تەلەگرافی سەروو، هەروەها لەگەڵ بریاری شورای دەوڵەت و ئەنجوومەنی تایبەتی وەکیلەکان بە رەزامەندی جەنابی پاشا بە فەرمانی پاشا فەرموویەتی، مقاوەلەنامەی ناوهاتوو وێنەیەکی هاوپێچ رەوان کراوە، جگە لەمە زانیاری دراوەتە نەزارەتی ناوهاتوو، بۆ جێبەجێ کردنی کارەکە هیممەت بکرێت و نووسراویش کراوە ئەفەندم.




HR.MKT.01234.00032.004

| HR.MKT | 01234.00032 | 27 شەوال 1299/ 11 ئەیلوول 1882 |
|---|---|---|
| وێنەی تەلەگرافنامە لە قوماندانیەتی لەشکری شەشەمی هومایۆن بۆ نەزارەتی جەنگی شکۆدار ڕۆیشتووە<br>ڕۆژی ١٣ی ئەم مانگە میر عەلی خان برای حوسێن قولی ئێرانی، بە ٢٠ ئەسپسوار سنووریان بەزاندووە و چوونەتە شەهربانی قەزای خانەقین، هێرشیان کردۆتە سەر تیرێك و کەسێکیان بە ناوی محەمەد ئەفەندی بریندار کردووە، تفەنگ و مایین و ئەوەی هاتۆتە پێشیان لە مەڕ تالان کردووە، دواتر ئەم مەفرەزەیەی بۆ چاودێری کردنیان دەرچووە، دوای ٢ کاتژمێر ڕووبەڕووی یەکتر بوونەتەوە و مەڕەکانیان وەرگرتۆتەوە و ٢ نەفەریش کوژراوە و ٢ نەفەری تریش بە زیندووی دەستگیر کراوە، جگە لەمە دوو مایین و تفەنگێکی سەربازی ئێران کەوتۆتە دەست سەربازان، لە مەفرەزەش تەنیا ئاژەڵێك لەناوچووە، ئەگینا زیانی تری نەبووە، ڕووداوەکە بە تەلەگراف لە قوماندانیەتی خانەقین ڕاگەیەندراوە، لە باڵیۆزی عوسمانیش بە والی کرمانشا ڕاگەیەندراوە. | | |

HR.MKT.01258.00090.001

| HR.MKT | 01258.00090 | 25 رەبیعی کۆتایی 1300/ 5 مارت 1883 |
|---|---|---|
| تەلەگرافنامەی پایەبەرز بۆ ویلایەتی بەغداد<br>سـەرچاوە و قورئـان لـە ئێـران بـۆ زاناکانـی ئێـران رەوان کـراوە، بـەڵام لـە گومرگـی خانەقیـن دەسـتی بەسـەرداگیراوە، لـە باڵیۆزخانەی ئێـران باسـکراوە، رەوانەی ئێـران بکرێتەوە. | | |

HR.MKT.01283.00055.001

| HR.MKT | 01283.00055 | 10 شەوال 1300/ 14 ئاب 1883 |
| --- | --- | --- |
| نووسراوی پایەبەرز بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>چەند ساڵ لەمەوبەر پردی خانەقین وێران بووە، لە بارەی نۆژەنکردنەوەی لەسەر هەندێك ووتە لە باڵیۆزخانەی عوسمانی لە تەهران نووسراو رەوان کراوە، وەرگێراوەکەی هاوپێچ پێشکەش کراوە، ئەوانەی کارەکە جێبەجێ دەکەن فەرمانیان پێ بکرێت، بۆ ئەمەش جەنابی پەیوەندیداری نەزارەت هیممەت بکات. | | |



HR.MKT.01244.00045.001

| 2 موحەررەم 1300/ 13 تشرینی دووەم 1882 | 01244.00045 | HR.MKT |
|---|---|---|

نووسراوی پایەبەرز بۆ باش وەکالەتی شکۆدار
محەمەد ئیسماعیل بەگ لەلایەن دەوڵەتی ئێرانەوە وەکو وەکیلی شەهبەندەری قەزای خانەقین سەر بە ویلایەتی بەغداد دامەزراندوە، بۆ داواکردنی فەرمانی پایەبەرزیش لە باڵیۆزخانە راپۆرت پێشکەش کراوە، هەروەها لەسەر راستی ئێران بوونی ناوبراو، لە راپۆرتەکە ئاماژەی پێکراوە، لە دیوانی همایۆن نووسراو کراوە، بۆ دەرچوونی فەرمانی پایەبەرز، جەنابی پاشا رەزامەندی نیشان بدات.



HH.İ..00060.00015.002

| 26 سەفەر 1302/ 15 کانوونی یەکەم 1884 | 00060.00015 | HH.İ |
|---|---|---|

جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
لـە موقاتەعـەی عەلیـاوەی سـەر بـە قـەزای خانەقینـی ویلایەتـی بەغـداد، زەوی لـە خاوەنەکانیـان کـراوە و خراوەتـە سـەر مولکـی میـری، لـە ئاشـەکانیش ئاشـی حەسـەن بـەگ لـە ٦ بـەش ١ بەشـی لـە ژێـر بەڕێوەبردنـی کەسـێکی تـرە، ئیـتر ئـەم بابەتـە خراوەتـە راپـۆرت و حوجەتـی شـەرعیەکەی رەوان دەکرێـت، حەجەتـی شـەرعی ئـەو داهاتـەی ماوەتـەوەش لەگـەڵ ئاشـەکانی تـر لـە قۆمیسـیۆنی زەوی میـری بەغـداد رەوان کـراوە، هاوپێـچ راگەیەنـدراوە و پێشـکەش کـراوە، لـەم بابەتـەدا بریـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمانـی بـە دەسـتەوەیە.


İ.DH 962/76095

4

İ.DH.00962

| 17 زیلحیجە 1302/ 27 ئەیلوول 1885 | 00962.076095 | İ.DH |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی مەکتوب
ژمارە ٦٥١
جەنابی پایەبەرزی پەیوەندیداری سەدارەت
راگەیەندراوی بەندەمانە
عەبدوڵڵا ئەفەندی قائیمقامی قەزای خانەقین لە ئەرکەکەیدا خزمەتە باشەکانی بینراوە، لە بارەی پاداشت کردنی بە پلەی سێیەم، دوو پارچە نووسراو لە ویلایەتی بەغداد و موشیرەتی لەشکری هومایۆنی شکۆدار پێشکەشی جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت کراوە، هەروەها قەزای ناوهاتوو دەکەوێتە سەر سنووری ئێران و گرنگی خۆی هەیە، لە ئاماژەکانی رووس روون بۆتەوە ماوەیەکی درێژە قائیمقامی ناوبراو کارگێرییەکەی بە رێکوپێکی بەرێوەبردووە، بەم تێروانینە پاداشت بکرێت، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمانی بەدەستەوەیە.


İ.MMS.00087

| 15 جەمادی یەکەم 1304/ 9 شوبات 1887 | 0087.003758 | I.MMS |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
ڕێگە بدرێت بازرگانی ئێرانی حاجی مەحمود تەبریزی وەکو کاری خێرخوازی پردەکەی شارۆچکەی خانەقین سەر بە ویلایەتی بەغداد نۆژەن بکاتەوە، لەم بارەیەوە تەلەگرافنامە لە ویلایەتی بەغداد هاتووە، مەزبەتەش لە ئەنجوومەنی تایبەتی وەکیلەکان دراوەتە قەڵەم، هاوپێچ بەیەکەوە راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی ملوکانە بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە.


İ.DH.01059

| İ.DH | 01059.083123 | 25 رەبیعی یەکەم 1305/ 11 کانوونی یەکەم 1887 |
|---|---|---|
| بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەت<br>دیوانی هومایۆنی ئێستا<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>قائیمقامەکانی خانەقین و عەزیزیە رەشید ئەفەندی و عەبدوللەتیف ئەفەندی لەلایەن دەوڵەتی ئێرانەوە، بە پلەی دووەم و سێیەم شیر و نیشانی خورشیدیان پێ دراوە، هەروەها لەلایەن ناوبراوان قەبول کراوە، بۆ دەستەواژەکانیشیان پێویستی بە رەزامەندییە، نووسراوی والی ویلایەتی بەغداد بە هاوپێچ راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی پاشا بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم. | | |



HR.MKT.01513.00094.001

| 12 شەوال 1306/ 11 حوزەیران 1889 | 01513.00094 | HR.MKT |
|---|---|---|
| نووسراوی پایەبەرز بۆ نەزارەتی مەکتەبی پزیشکی<br>دکتور نیل لە خانەقینی سەر بە ویلایەتی بەغداد نیشتەجێیە، وێنەی بروانامەی پەسەندکراوی لەگەڵ راپۆرتی باڵیۆزی ئۆستورالیا لە مێژووی ٤ رەمەزان ١٣٠٦ رەوان کراوە، خەرجی پەسەندکرنی بروانامەکەی ٥ لیرەی عوسمانیە و رەوان کراوە، ئەمجارە لە باڵیۆزخانەی ناوهاتوو راپۆرتی وەرگێردراو و برە پارەی باسکراو بەیەکەوە رەوان کراوە، مامەڵەی پێویست جێبەجێ بکرێت و کۆتایی بە کارەکە بهێنرێت. | | |


OSMANLI ARŞIVI DAIRE BAŞKANLIĞI

i.mms-104/4447

İ.MMS.00104

<table>
<tr><td>I.MMS</td><td>0104.004447</td><td>12 رەمەزان 1306/ 12 مایس 1889</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەت<br>دیوانی هومایۆنی ئێستا<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>لە رێگای نێوان خانەقین و بەغداد لە ناوچەی بەنی سەعد، خانەیەك لەلایەن والی کرمانشا حوساموڵمولك بۆ میوانداری کردنی بە خۆرایی گەشتیارانی عەتەبە دروست دەکرێت، لەسەر نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار مەزبەتە لە ئەنجوومەنی تایبەتی وەکیلەکان دراوەتە قەڵەم، بە هاوپێچەوە راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی پاشا بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.</td></tr>
</table>


OSMANLI ARŞİVİ
HR.MKT
1535 | 85 | 1

HR.MKT.01535.00085.001

<table>
<tr><th>HR.MKT</th><th>01535.00085</th><th>28 زیلحیجه 1306/ 25 ئاب 1889</th></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ جەنابی عالی جەنابی پەیوەندیداری نەزارەت<br>١٥٩٤ ژمارەی گشتی<br>٥٦ ژمارەی تایبەتی<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندی<br>لەسەر سکاڵا و ئاماژەی حکوومەتی ناوەخۆ، ئێران پەیوەست کراوە دەستپێشخەری بکرێت، لە دوورخستنەوەی کارپەردازی سلێمانی و خانەقین حەبیب خان و ئیسماعیل خان لە پۆستەکانیان، چونکە زۆربەی هاوولاتی عوسمانی لەلایەن شەهبەندەرەکانی ئێران زوڵم و غەدریان لێکراوە، ئەگەرچی لەسەر سکاڵای حکوومەتی ناوەخۆ بە کێشەوە دوورخراونەتەوە، بەڵام بە تێپەربوونی کاتێکی کورت لە شوێنێکی تر دامەزراون، بارودۆخە خراپەکەش دووبارە بۆتەوە، بەم کارەش هەم فەرمانبەرانی عوسمانی بەم شەهبەندەرانە سەرقاڵ دەکەن، هەم باڵیۆزخانەی عوسمانی داوای دووبارە بەکارنەهێنانەوەی دوورخراوان دەکات، ئەوەی لەم دواییە روویداوە لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت و بە گوێرەی ئەم وەڵامەی وەردەگیرێت کارەکە پەسەند بکرێت، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بەدەستەوەیە.<br>مۆری خەلیل خالد باڵیۆزی تەهران</td></tr>
</table>



HR.MKT.01543.00071.002

| 1 ڕەبیعی کۆتایی 1307/ 25 تشرینی دووەم 1889 | 01543.00071 | HR.MKT |
|---|---|---|
| بابی عالی<br>فەرمانگەی دەرەوە<br>قەڵەمی مەکتوب<br>تەلەگرافنامەی باڵیۆزخانەی عوسمانی لە تەهران ڕەوان کراوە<br>حوسامولملوك نەقشی بە نەخۆشی دڵ کۆچی دوای کردووە و ڕێگە نەدراوە تەرمەکەی بە خانەقیندا تێپەڕێت، بۆ پەرینەوە و گواستنەوەی تەرمەکەی بۆ عەتەباتی عالیە، لەلایەن وەزیری پایەبەرز نووسراوی تایبەت ڕەوان کراوە، بەپەلە ڕاگەیەندراوە و جێبەجێ کراوە. | | |



HR.MKT.01568.00008.001

| 1 رەمەزان 1307/ 21 نیسان 1890 | 01568.00008 | HR.MKT |
|---|---|---|

نووسراوی پایەبەرز بۆ باڵیۆزخانەی ئێران
ناسر کوڕی عەلی ئەکبەر لە ناحیەی حاجی قەرە سەر بە قەزای خانەقین نیشتەجێیە و داوای مۆڵەتی شوێنکەوتووی کردووە، لەم بارەیەوە گفتوگۆ کراوە، بۆ جێبەجێ کردنی مامەڵەکەش پرس بە ویلایەتی بەغداد کراوە، دواتر چۆنیەتی کارەکە حەواڵەی قەڵەمی شوێنکەوتووان کراوە، لە ئەوراقی دەوڵەتی عالی و راپۆرتی کارپەرداز دەردەکەوێت ناوبراو داوای مانەوەی کردووە بۆ ئەوەی لەگەڵ کچی رزا عاشق هاوسەرگیری بکات، دوای چاودێری و لێکۆڵینەوە مارەبرینەکەی کراوە، بۆیە بە شوێنکەوتە قەبوڵ ناکرێت، چونکە بە گوێرەی یاسای دەوڵەتی عوسمانی هاووڵاتی عوسمانی بۆی نییە و قەدەغەیە هاوسەرگیری لەگەڵ هاووڵاتی ئێرانی هاوسەرگیری بکات، بڕیاریش دراوە دەبێ ئێرانیەکان لە دەوڵەتی عوسمانی دەربکرێن و دوور بخرێنەوە، بەم بڕیارەوە شوێنکەوتووی عوسمانی ناوبراو گونجاو نییە، ئامۆژگاری پێویست لە ویلایەتی ناوهاتوو دەرچووە و بە راگەیاندنی نووسراو کراوە.


İ.DH.01177

i.DH 1177/92055

<table>
<tr><td>İ.DH</td><td>01177.092055</td><td>24 رەمەزان 1307/ 14 مایس 1890</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەت<br>دیوانی هومایۆنی ئێستا<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>لەلایەن دەوڵەتی ئێرانەوە وەکو پاداشت نیشان دراوەتە کامل حوسنی ئەفەندی ئاغای تابووری سنووری قەزای خانەقین، لەلای ناوبراوەوەش نیشانەکە قەبوڵ کراوە، نووسراوی ویلایەتی بەغداد راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی ملوکانە بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.</td></tr>
</table>




HR.MKT.01549.00069.002

| HR.MKT | 01549.00069 | 2 جەمادی یەکەم 1307/ 25 کانوونی یەکەم 1889 |
|---|---|---|

نووسراوی پایەبەرز بۆ ویلایەتی بەغداد

کوڕەکانی محەمەدی ئێرانی کە لە شارۆچکەی خانەقین لەدایکبوونە، ئەمجارە داوایان کردووە بە بەندەی دەوڵەتی عوسمانی هەژمار بکرێن، لە بارەی ڕۆستەم و براخاس بە نووسراو داوای زانیاری لە شەهبەندەر کراوە، لەم وەڵامەی هاتووە نووسراوی ویلایەتی شکۆدار لە مێژووی ٢١ سەفەر ١٣٠٧ دراوەتە قەڵەم، لە کاتی حەواڵە کردن لەبارەی ناوبراوان ئەوەی پێویستە لە مامەڵە ئەنجام بدرێت، نووسراو ڕێکخراوە و ڕەوان کراوە، کارەکەش لەسەر بڕیار و فەرمانی پەیوەندیداری ویلایەت وەستاوە.



HR.MKT.01549.00069.001

<table>
<tr><th>HR.MKT</th><th>01549.00069</th><th>21 سەفەر 1307 /17 تشرینی یەکەم 1889</th></tr>
<tr><td colspan="3">ویلایەتی بەغداد<br>ژمارە ١١<br>بۆ نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>رۆستەم و براکەی بە ناوی براخاص دانیشتووی شارۆچکەی خانەقین داوایان کردووە وەکو هاووڵاتی عوسمانی قەبوڵ بکرێن، ئەگەرچی باوکیان بە ناوی محەمەد ئێرانیش بێت، بەڵام دایکیان هاووڵاتی عوسمانیە، رۆستەم لە ساڵی ١٢٥٥ و براخاص لە ساڵی ١٢٦٥ لە شارۆچکەی ناوهاتوو لە دایك بوون، هەر لەم کاتەوە لەوێ نیشتەجێن و تا ئێستا دەستگیر نەکراون و نەدراونەتە دادگا، بەم راگەیەندراوە وەڵامدا لەم مەزبەتەیەی لە ئەنجوومەنی کارگێری قەزای خانەقین هاتووە، ئاماژەی پێکراوە پشت بەستن بە ماددەکانی ٢ و ٣ ی یاسانامەی ژێردەستەی عوسمانی ئەگەر ناوبراوان وەکو شوێنکەوتووی دەوڵەتی عالی هەژمار بکرێن، ئەو کاتە لە شەهبەندەر خانەکەیان دەگۆرێت و نابێت پەیوەندییان بە ئێرانەوە هەبێت، لە باش شەهبەندەری بەغداد-ئێران داوای زانیاری کراوە، لە وەڵامدا نووسراو هاتووە سەرەتا رۆستەم کچەکەی لە ئێرانییەك مارە کردووە بەڵام دواتر پەشیمان بۆتەوە و لە کەسێکی تری مارە کردووە، بۆیە ئێرانیەکە داوای ئەو برە پارەیەی کردووە کە پێیانی داوە، ئەم تێبینیە بۆتە هۆی دەستپێشخەری بکات لە گۆرینی پێشکەوتووی، ئاماژەی پێکراوە و راگەیەندراوە ئەگەر بێتو ناوبراوان شوێنکەوتوویی رەت بکرێتەوە ئەو کاتە رادەستی فەرمانبەرانی سنوور بکرێنەوە، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمانی بەدەستەوەیە.<br>والی ویلایەتی بەغداد مۆری مستەفا عاسم کوری حەسەن</td></tr>
</table>

HR.MKT.01568.00007.012

| HR.MKT | 01568.00007 | 1 رەمەزان 1307/ 21 نیسان 1890 |
|---|---|---|

ناسر کوری ئەکبەری ئێرانی لە ناحیەی حاجی قەرە سەر بە شارۆچکەی خانەقین نیشتەجێیە، داوای کردووە لە دەوڵەتی عوسمانی وەکو شوێنکەوتوو قەبوڵ بکرێت، دوای گفتوگۆ لەسەر ناوبراو تۆمارەکەی رەوان کراوە، نووسراوی ٢٨ جەمادی یەکەم ١٣٠٧ ژمارە ١٣ ی پەیوەندیداری ویلایەت خوێندنەوەی بۆ کراوە، دوای حەواڵەکردنی بۆ قەڵەمیش، لە راپۆرتی کارپەردازی ئێران هاتووە، ناوبراو لەگەڵ کچی رزا عاشق بەتەمای هاوسەرگیرییە، بە راگەیاندنی دەرکەوتووە تەنیا مارەبرینەکەی کردووە، بۆیە بە شوێنکەوتووی دەوڵەتی عوسمانی وەرناگیرێت، قەدەغەکراوە ئێرانی لەگەڵ ئافرەتی دەوڵەتی عوسمانی هاوسەرگیری بکات، بریاردراوە ئێرانیەکان لە دەوڵەتی عوسمانی دەردەکرێن و دوور دەخرێنەوە، بەم تێروانینە ناوبراو قەبوڵ ناکرێت و بریاری کۆتایی لەسەر دراوە، ئەم نووسراوەی رێکخراوە وێنەیەکی رەوان کراوە.

HR.MKT.01561.00054.003

| HR.MKT | 01561.00054 | 23 ڕەجەب 1307/ 15 مارت 1890 |
|---|---|---|

وەڵامنامەی پایەبەرز بۆ باڵیۆزخانەی عوسمانی لە تەهران
لەلایەن حکوومەتی ئێران زنجیرەیەك سەرپێچیان کردووە، لەگەڵ ئەمەش زۆر ئیمتیازیان پێ دراوە، لەمانە دروست کردنی ڕێگایەك لە تەهران تا خانەقین، بە پێویست زانراوە ئەم ڕێگایە لە زەوییەکانی سەنجەقی زەهاب درێژ دەبێتەوە، بەپێی ڕێککەوتنی ئەرزروم لە سەنجەقی ناوهاتوو زەوییەکانی بەشی ڕۆژئاوا کە لە ژێر دەسەڵاتی ئێران ماوەتەوە، تا دەریاچەی گەرەند سەر بە دەوڵەتی عالیە، لەم حالەتەدا لە باڵیۆزخانەی عوسمانی ڕێکخستنی بۆ دەکرێت، هەرچی ئاماژە و دامەزراندنی ئەرکەکان لەسەر نووسراوی مێژووی کۆتایی جەمادی یەکەم ١٣٠٧ ژمارە ١٧٣٩ ڕەزامەندی لە پەیوەندیدارانی سەدارەت وەرگیراوە، بە گوێرەی ڕێککەوتنی ناوهاتوو دەبێ لەسەر زەوی دەوڵەتی عالی ڕێگاکە دروست بکرێت، بۆ ئەمەش لەلایەن دەوڵەتی ئێرانەوە هەر ئیمتیازێك بدرێت یەکسەر ڕەت بکرێتەوە، بەم ڕاگەیەندراوە ئاماژەی باڵیۆزخانە بە بڕیاری ئەنجوومەنی تایبەت وەڵام دراوەتەوە، بڕیاری لەسەر بدرێت.




HR.MKT.01568.00007.010

| HR.MKT | 01568.00007 | 1 رەمەزان 1307/ 21 نیسان 1890 |
|---|---|---|

ئەم نووسراوانەی لە ویلایەتی بەغدادی شکۆدار هاتووە، هاوپێچ راپۆرتێکی کارپەردازی بەغداد-ئێرانی لەگەڵە، تێدا هاتووە ناسر کوڕی عەلی ئەکبەر لە ناحیەی حاجی قەرە سەر بە قەزای خانەقین نیشتەجێیە، شوێنکەوتووی دەوڵەتی عوسمانیە، هاتنی بەمەبەستی پێکهێنانی ژیانی هاوسەرگیری بووە لەگەڵ کچی رزا عاشق، تەنانەت لە کاتی داواکاریەکەی رایگەیاندووە مارەبرینەکەی ئەنجام داوە و راگەیەندراوە رەتکردنەوەی شوێنکەوتووەکەی ناکرێت، ئەگەرچی لە هاوپێچی نووسراوەکانی ناوهاتوو ئەگەر چیرۆکەکەی راستیش بێت، قەدەغەکراوە نابێت خاتوونەکانی عوسمانی لەگەڵ هاووڵاتی ئێرانی هاوسەرگیری بکەن، بە گوێرەی بریار پێش راگەیاندنی ئەم بریارە ئەو ئافرەتەی هاوسەرگیری لەگەڵ ئێرانی کردبێت منداڵەکەی ئێرانیە و ئەوانەی دوای راگەیاندنی بریارەکەش هاوسەرگیری کردبێت دەبێت ئەم ئێرانیانە لە دەوڵەتی عوسمانی بخرێنە دەرەوە، ئەگەر ناسر کوڕی عەلی ئەکبەر بە راست خێزاندارە ئەوا جێگەی قەبوڵ نییە و بە گوێرەی بریار مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت، وەڵام بدرێتە ویلایەتی ناوهاتوو و بە نووسراو لە باڵیۆزخانەی ئێران تۆماری کەسێتی راگەیەندراوە، پێویستە جەنابی پەیوەندیداری نەزارەت بە فەرمانی عالی بریاری لەسەر بدات، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمانی بەدەستەوەیە.


OSMANLI ARŞİVİ
HR.MKT
1557 38

HR.MKT.01557.00038.001

| 27 جەمادی کۆتایی 1307/ 23 کانوونی دووەم 1890 | 01557.00038 | HR.MKT |
|---|---|---|

نووسراوی پایەبەرز بۆ جەنابی پاشای پەیوەندیداری سەدارەت
لەلایـەن حکوومەتـی ئێرانـی تاقمێـك کاری خـراپ ئەنجـام دراوە، ئـەم جـارەش بـۆ دروسـت کردنـی رێـگای تەهران-موحەممـەرە، ئیمتیـازات دراوەتـە کۆمپانیەکـی بێگانـە، هەروەهـا لەبـەر زۆری ئـەو ئێرانیانـەی بـۆ عەتاباتـی عالـی هاتووچـۆ دەکـەن، رێگایـەك لـە تەهـران تـا سـنووری خانەقیـن دروسـت بکرێـت، ئەگەرێکـی زۆر هەیـە ئیمتیـاز بـە کۆمپانیـای بێگانـە بدرێـت، پێویسـتە ئـەم رێگایـە لـە زەوییەکانـی سـەنجەقی زەهـاب درێـژ بێتـەوە، بـە پێـی بریـاری مـاددەی دووەمـی پەیماننامـەی ئـەرزروم لـە لایەنـی رۆژئـاوای سـەنجەقی ناوهاتـوو تـا رووبـاری گەرەنـد لـە ژێـر دەسـەڵاتی ئێرانیەکانـە، تـەواوی زەوی تەختاییەکـەش سـەر بـە دەوڵەتـی عالیـە، لەبـەر ئـەوە ئەگـەر لەلایـەن حکوومەتـی ناوهاتـوو ئیمتیازەکـە دەربچێـت، لـەوێ دروسـت دەکرێـت، بۆیـە لەبـەر چەندیـن سـوودی بێگانـە، ئەگـەر زەوییـە ناوهاتـووەکان بگەرێندرێتـەوە بۆ دەوڵـەت، ئـەوا کێشـە بـۆ حکوومەتـی عوسـمانی دروسـت دەبێـت، بـۆ ئـەم مەبەسـتە لەلایـەن باڵیۆزخانـەی عوسـمانی ئیمتیازێـك رێـك دەخرێـت، بـۆ دامەزراندنـی ئەرکـەکان و ئامـاژە پێکردنیشـی نـووسراو لـە باڵیۆزخانـەی تەهـران هاتـووە، وێنەیەکـی مـاددەی دووەمـی پەیماننامـەی ناوهاتـوو لـە دیوانـی همایـۆن دەرهێـنراوە و پێشـکەش کـراوە، بـە تێروانیـن لـە بابەتەکـە بریـار و نـووسراوی بـۆ بکرێـت و نووسراوەکانـی ناوهاتـووش رەوان بکرێتـەوە، بریـار و فەرمـان بـۆ پەیوەندیـداری سـەدارەتە.



İ.DH.01200

| 6 رەبیعی یەکەم 1308/ 20 تشرینی یەکەم 1890 | 01200.093891 | İ.DH |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
ئـەم قشـلەیەی بـۆ نیشـتەجێ کردنـی تابـووری سـنووری قـەزای خانەقیـن سـەر بـە ئـاڵای زەبتیـەی ویلایەتـی بەغـداد دانـراوە، بەهـۆی هەسـتانەوەی ئـاوی رووبـاری ئەلوەنـد بـە شـێوەیەکی زۆر مەترسـیدار وێـران بـووە، سـەرەتا بـۆ نۆژەنکردنـەوەی قشـلەی ناوهاتـوو بـری ٣٣٣٠ قـوروش لـە سـەدەقەی جەنابـی پاشـا خـەرج بکرێـت، جگـە لەمـە بـە دەرخسـتە و کەمکردنـەوە، بـری ٥٦٤٣ قوروشـی تـر زیـاد بکرێـت، بـرە پـارەی دیاریکراویـش لـە رێکخسـتنی دروسـت کـردن و نۆژەنکردنـەوەی سـاڵی ١٣٠٦ دابیـن دەکرێـت، بـۆ جێبەجـێ کردنی کارەکە نـووسراوی سـەرووی سـەر عەسـکەر راگەیەنـدراوە و پێشـکەش کـراوە، لـەم بابەتـەدا جەنابـی پاشـا بـە فەرمانـی پاشـا چ بفەرمووێـت جێبەجـێ دەکرێـت، بـە راگەیاندنـی نـووسراو کـراوە ئەفەنـدم.


İ.DH.01228

<table>
<tr><th>İ.DH</th><th>01228.096169</th><th>23 شەوال 1308/ 1 حوزەیران 1891</th></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەت<br>دیوانی هومایۆنی ئێستا<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>قائیمقامیەتی قەزای هندیە بە کراوەیی ماوەتەوە، رەشید ئەفەندی قائیمقامی خانەقین لە قەزای هندیە و لە شوێن ئەویش تاهیر ئەفەندی قائیمقامی شامیە دامەزرێن، بۆ ئەم مەبەستەش مەزبەتەی قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران دراوەتە قەڵەم، نووسراوی نەزارەتی ناوخۆی شکۆداریش راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی پاشا بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.</td></tr>
</table>


İ.HR 322/20823

İ.HR.00322

| İ.HR | 00322.020823 | 18 زیلقەعدە 1308/ 25 حوزەیران 1891 |
|---|---|---|

نەزارەتی کاروباری تەندروستی
هۆبەی تەحریرات
ژمارە ٣٠
جەنابی پەیوندیداری سەدارەت
ڕاگەیەندراوی بەندەمانە
لـە کەرەنتینـەی خانەقیـن دکتـۆر نیقۆلاییـدس ئەفەنـدی لـە کاتـی هەوڵەکانـی کۆتایـی هێنـان بـە نەخۆشـی کۆلێـرا، خزمەتـی باشـی بیـنراوە، بۆیـە پاداشـت بکرێـت و لـە پلـەی چـوارەم نیشـانێکی مەجیـدی پـێ بدرێـت، بـۆ ئـەم مەبەسـتەش نـووسراو لـە ویلایەتـی بەغـدادی شـکۆدار هاتـووە و بـە تێروانیـن لـە بابەتـەکان و وەرگرتنـی ڕەزامەنـدی، بریـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمانـی بەدەسـتەوەیە.
نازری تەندروستی


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
26 | 1882

BEO.000026.001882.001

<table>
<tr><th>BEO</th><th>000026.001882</th><th>2 زیلحیجه 1309/ 28 حوزەیران 1892</th></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ زیارەتی عەتەباتی عالیە، گەشتیارەکانی ئێران لەلای خانەقین سنوور دەبەزێنن، تاوەکو رووبەروبوونەوەی سەربازی روونەدات، بە نووسراوی ئەمرۆ بە سەرعەسکەر ووتراوە، بۆ گەرانەوەی گەشتیاران، سەرەتا بە شێوەیەکی نەرم ئاگادار بکرێنەوە، ئینجا هۆکاری قەدەغەکردنی هاتووچۆکردنیان جێبەجێ بکرێت، ئەگەر بێتو بەم شێوەیە ئەنجام دەست نەکەوێت، خوانەخواستە لە کاتی سەرپێچی و ئەوانەی دەیانەوێت بە زۆری بۆ ئەم لایەنە بپەرنەوە تا ئەوان چەك بەرز نەکەنەوە سەربازانی ئێمە چەك بەرز نەکەنەوە، بۆ ئەمەش ئاگاداری بدرێتە فەرمانبەرانی سنوور، هەروەها ئاگاداری دراوەتە ویلایەتی بەغدادی شکۆدار بە راگەیاندنی نووسراو کراوە.</td></tr>
</table>



| 15 موحەررەم 1309/ 21 ئاب 1891 | 00322.020823 | İ.HR |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
پزیشکی کەرەنتینەی خانەقین دکتور نیقۆلاییدیس ئەفەندی، لە کاتی کۆتایی هێنان بە نەخۆشی کۆلێرا، کاری باشی بینراوە، بۆیە لە پلەی چوارەم نیشانی مەجیدی نیشانی پێ بدرێت، لەم بارەیەوە نووسراوی نەزارەتی تەندروستی شکۆدار راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی پاشا بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.
سەدری ئەعززەم



İ.DH.01251

| 20 رەبیعی کۆتایی 1309/ 23 تشرینی دووەم 1891 | 01251.098090 | İ.DH |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
دوای ئـەوەی ئێرانیـەکان هێرشیان کردۆتـە سـەر ناوچەیـەك بـە نـاوی کانـی بـەزی خانەقین، بریـاری دوورخسـتنەوە و دەرکردنـی ئێرانیـەکان دەرچـووە، لـە جێبەجـێ کردنـی ئـەم بریـارەش تاهیـر ئەفەنـدی قائیمقامـی خانەقیـن سـەرکەوتنی بەدەسـت هێنـاوە، بـۆ ئـەم مەبەسـتە بـۆ پلـەی دووەم چینەکـەی بـەرز بکرێتـەوە، هەروەهـا ئاغـای بلـۆك سـەفەر ئاغـا لـە بلۆکـی سـێیەمی تابـووری سـەر سـنوور سـەر بـە ئـاڵای زەبتیـەی بەغـداد لەگـەڵ ئەحمـەد ئەفەنـدی ئەمینـی ژورناڵـی بلۆکـی یەکەمـی سـوارەی سـەر بـە تابـووری دووەم لەگـەڵ لـە سـەرۆك عەشـیرەتەکان مسـتەفا بـەگ و والـی ئاغـا بـە پلـەی پێنجـەم نیشـانێکی مەجیدیـان پـێ بدرێـت، لـەم بارەیـەوە تەلەگرافنامـە لـە ویلایەتـی بەغـداد وەرگیـراوە و بـە هاوپێـچ راگەیەنـدراوە و پێشـکەش کـراوە، لـەم بابەتـەدا جەنابـی ملوکانـە بـە فەرمانـی پاشـا چ بفەرمووێـت جێبەجـێ دەکرێـت، بـە راگەیاندنـی نـووسراو کـراوە ئەفەنـدم.


باب عالی
دائرهٔ صدارت
امور دیوان همایون

İ.DH 1258/98829

İ.DH.01258

<table>
<tr><td>İ.DH</td><td>01258.098829</td><td>20 جەمادی کۆتایی 1309/ 21 کانوونی دووەم 1892</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەت<br>دیوانی هومایۆنی ئێستا<br>تابووری ئاغا مەحمود ئەفەندی ئیزمیرلی لە تابووری شەشەمی خانەقین سەر بە ئاڵای زەبتیەی ویلایەتی بەغداد، پیر و ئیفلیج بووە، لە شوێن ئەو ئاغای قۆڵی تابووری ئیسفاکیە بە کراوەیی ماوەتەوە، حەسەن بەگ چەرکەس بە پلەی تابووری ئاغا لە ئاغای تابووری خانەقین دامەزرێت، بۆ ئەم مەبەستەش لە فەرمانگەی ژاندارمە مەزبەتە دراوەتە قەڵەم، بە راگەیاندنی کاری جێبەجێ کردن، هەروەها بە راگەیاندن و پێشکەش کردنی نووسراوی سەر عەسکەر دەبێت، لەم بابەتەدا جەنابی پاشا بە بریار و فەرمانی هومایۆن چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.</td></tr>
</table>


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
100 | 7454 | 1

BEO.000100.007454.001

| BEO | 000100.007454 | 12 رەبیعی کۆتایی 1310/ 3 تشرینی دووەم 1892 |
|---|---|---|

پوختەی ئەوراق
بۆ ویلایەتی بەغداد
تەنیا لە کرمانشا نزیکەی ٤٠٠ گەشتیاری ئێرانی هەیە، بۆ ئەوەی خانەی پاراستنی (تحفظ خانە) خانەقین قەڵەباڵغ نەبێت، بە پەرشوبڵاوی هەر جارە ١٥٠ کەس بۆ ماوەی ١٠ رۆژ کەرەنتینە بکرێن، دوای خاوێن بوونەوە مۆڵەت بدرێت بە پەرینەوەیان، لەسەر ئاماژەی نەزارەتی تەندروستی جێبەجێ بکرێت.




İ.AS.00003.00009.003

| İ.AS | 00003.00009 | 4 رەمەزان 1310/ 22 مارت 1893 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
٢٣٣٣
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
لـە فەرمانگـەی تەندروسـتی لێکۆڵینـەوە لـە زانیارییەکانـی ئاغـای تابـووری پێشـوو مەحمـود ئەفەنـدی ئیزمیرلـی لـە تابـووری شەشـەمی سـنووری خانەقیـن سـەر بـە ئـاڵای زەبتیـەی ویلایەتـی بەغـداد کـراوە، دەرکەوتـووە مووچەکـەی لـە پلـەی یەکەمـە و مانگانـە ٧٥٠ قـوروش مووچـەی، بـۆ جێبەجـێ کردنـی خانەنشـینیەکەی ناوبـراو لـە چاوەڕوانـی ماوەتـەوە، لـە سـەدا ٥ی هەیـە، کەواتـە ٥٤٥ و نیـو مووچـەی بـۆ دابیـن دەکرێـت، پشـت بەسـتن بـە مووچـەی خانەنشـینیەکەی لـە پـارەی سـەنجەقی کەرکـووك ڕێـك دەخرێـت، مەزبەتـە لـە فەرمانگـەی ژاندارمـە ڕێکخـراوە، لەگـەڵ نـووسراوی سەرعەسـکەری سـەروو ڕاگەیەنـدراوە و پێشـکەش کـراوە، لـەم بابەتـەدا جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا چ بفەرمووێـت جێبەجـێ دەکرێـت، بـە ڕاگەیاندنـی نـووسراو کـراوە ئەفەنـدم.
سەدری ئەعزەم و یاوەری




İ.AS.00002.00020.002

| 23 جەمادی کۆتایی 1310/ 12 کانوونی دووەم 1893 | 00002.00020 | İ.AS |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
١٧٣٥
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
لە ناو ویلایەتی بەغداد قەزای خانەقین و لە ناو سەنجەقی شارەزوور و سەر سنووری ئێران تابووری زەبتیەی سەر سنوور نیشتەجێ کراوە، بەڵام ٣٢ منارەی چاودێری وێران بووە، بە پێویست زانراوە ٣١ منارە نۆژەن بکرێتەوە و یەکێکیش سەر لە نوێ دروست بکرێتەوە، ئەم دەرخستەی کراوە بە کەمکردنەوەی خەرجیەکەیان، بری ٥٦,٦٣٧ قوروش کارەکە جێبەجێ دەکرێت، بە دامەزراندنی قۆمیسیۆنێکی تێکەڵاو خراوەتە ژێر نەزارەت، منارەکانی ناوهاتوو بخرێنە سەر ئەم دامەزراوەیە، یاخود بدرێتە ئەمانەت، بۆ دابین کردنی خەرجی ناوهاتوو لە بودجەی ساڵی ١٣٠٨ی ژاندارمەی گشتی رێك دەخرێت، لەم بارەیەوە نووسراوی سەرووی سەرعەسکەر بە هاوپێچەوە راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.




بغداد ولايتنه تلغرافنامهٔ سامی

علاء الدوله حضرتلرینه ذاتاً مخصوص اولمق اوزره سیاسیه ایدیکی آلتی رأس بارگیرك
خانقین‌دن امراری درسعادت ایران سفیری سابق محسن خان حضرتلرینك اشعاری
اوزرینه بالاستیذان مسلغ سنیهٔ حضرت خلافتپناهی شرفصدور بیورلمغین اجرای
ایجابی [illegible]



BEO.000381.028570.001

| 30 رەمەزان 1311/ 6 نیسان 1894 | 000381.028570 | BEO |
|---|---|---|

تەلەگرافنامەی پاشا بۆ ویلایەتی بەغداد
٦ بارگیـر تایبـەت بـە جەنابـی عەلائولدەولـە داواکـراوە، بـۆ ئـەوەی بـە سـنووری خانەقیـن تێپەڕێـت، لەسـەر ئامـاژەی جەنابـی موحسـین خـان باڵیـۆزی پێشـووی ئێـران, لـە دەرسـەعادەت ڕەزامەنـدی لەلایـەن جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت دەرچـووە.



HH.İ..00092.00046.003

| 5 زیلحیجە 1311/ 9 حوزەیران 1894 | 00092.00046 | HH.İ |
|---|---|---|

خەزینەی تایبەتی شاهانە
قەڵەمی تەحریرات
ژمارە ١٩١
لـە داهاتـی ناوەخـۆی هومایـۆن پێداویسـتی ڕۆژانـە لەگـەڵ خـۆراکـی دەروێـش و هەژارانـی تەکیـەی تەریقەتـی نەقشـبەندی لـە قـەزای خانەقیـن سـەر بـە ویلایەتـی بەغـداد دابیـن دەکرێـت، کـە برەکـەی مانگانـە ٤٠٠ قـوروش مووچـە دەکات، بـۆ ئەمـەش لەلایـەن پۆسـت نشـینی تەکیەکـە و دەروێشـەکان و گشـت لایـەك سوپاسـنامە ڕەوان کـراوە، مەزبەتـەی ئەنجوومەنـی کارگێـری قـەزای ناوهاتـوو هاتـووە و هاوپێـچ ڕاگەیەنـدراوە و پێشـکەش کـراوە، بڕیـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەم کەسـەیە کـە فەرمانـی بـە دەسـتەوەیە.



HH.İ..00089.00055.001

<table>
<tr><td>8 رەجەب 1311/ 15 کانوونی دووەم 1894</td><td>00089.00055</td><td>HH.İ</td></tr>
<tr><td colspan="3">خەزینەی تایبەتی شاهانە<br>قەڵەمی تەحریرات<br>ژمارە ٧٣٧<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>لە شارۆچکەی حاجی قەرە کە مەرکەزی قەزای خانەقینی سەر بە ویلایەتی بەغدادە، لە شێخەکانی تەریقەتی نەقشبەندی تەکیەی خوالێخۆشبوو شێخ عوسمان ئەفەندی تەوێلەیی هیچ داهاتێکی لە ئەوقاف بۆ دابین نەکراوە، بۆ نۆژەنکردنەوە و راخستنی تەکیەی ناوبراو و پاشکۆکانی هەروەها دابین کردنی قوتی رۆژانەی هەژار و دەستکورتانی تەکیەکە، مانگانە ٤٠٠ قوروش وەکو سەدەقەی پاشا لە داهاتی موقاتەعەی عولیای قەزای ناوهاتوو دابین دەکرێت، لە قۆمیسیۆنی زەوییەکانی میری ویلایەتی بەغداد مەزبەتە هاتووە و بریار و فەرمانی پاشا هەر چییەك بێت جێبەجێ دەکرێت، بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.<br>نازری خەزینەی تایبەت</td></tr>
</table>



| 26 رەمەزان 1311/ 2 نیسان 1894 | 00343.00061 | İ.HR |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
٣١٣٣
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
٦ بارگیر تایبەت بە خودی جەنابی عەلائولدەولە سپاریش کراوە، بۆ پەرینەوەیان لە سنووری خانەقین، لە تەلەگرافنامەی وەرگێردراوی باڵیۆزی پێشووی ئێران جەنابی موحسین خان داوای هاوکاری کراوە، هاوپێچ لەگەڵ نووسراوی نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا بریار و جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی هومایۆن چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.

سەدری ئەعزەم و یاوەری



İ.HR.00343.00061.001

| 29 رەمەزان 1311/ 5 نیسان 1894 | 00343.00061 | İ.HR |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی کاروباری دەرەوە
هۆبەی وەرگێران
لـە تەهـران تەلەگرافنامـەی وەرگێـردراوی جەنابـی موحسـین خـان لـە مێـژووی ٢٠ مـارت ١٢٩٤ بـۆ نەزارەتـی دەرەوە رەوان کـراوە
بـۆ خزمەتـی خـودی جەنابـی عەلائولدەولـە ٦ بارگیـر ئامادەکـراوە و بـۆ تێپەربوونـی ئـەم بارگیرانـەش داوای هـاوکاری کـراوە، ئەگـەر بکرێـت تـکا دەکـەم فەرمانـی پێویسـت بدرێتـە فەرمانبەرانـی خانەقیـن، مـن بـۆ ئـەم سپاریشـە ئەرکـم پـێ دراوە، سوپاسـی راگەیاندنـی ئێـوە دەکـەم.




BEO.000438.032806.001

| 15 موحەررەم 1312/ 19 تەمموز 1894 | 000438.032806 | BEO |
|---|---|---|

لە فەرمانبەرانی سەر سنووری ئێران، سەرتیپ عەزیز خان لەگەڵ هاوکارانی لەسەر سنووری دەوڵەتی عوسمانی بە کاری سەرپێچی تاوانبارن، لە بارەی دوورخستنەوەیان لە سنوور، حکوومەتی ئێران بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە دەستپێشخەری کردووە، بەڵام لە نووسراوی باڵیۆزخانەی تەهران دەردەکەوێت هیچ ئەنجامێکی نەبووە، تا دەروات سەرپێچی ئەمانەش زیاد دەکات، ئەگەر بەم شێوەیەش بەردەوام بێت بارودۆخی سنوور خراپتر دەبێت، ئەوەی ئاشکرایە شوێنی چەتەکانی ناوهاتووش قەزای خانەقینە، بۆیە مەفرەزەی نیزامیە لە قەزاکە زیاد بکرێت و ئامادە کاری بکرێت بۆ نەهێشتنی سەرپێچی ناوبراو، بۆ جێبەجێ کردنی ئەم کارەش ئاگاداری دراوەتە موشیرەتی شکۆدار و تەلەگرافنامە لە مێژووی ٤ تەمموز ١٣١٠ ی ویلایەتی بەغداد بۆ سپاهیدار بەرز کراوەتەوە.



BEO.000643.048203.002

<table>
<tr><th>BEO</th><th>000643.048203</th><th>22 زیلحیجة 1312/ 6 حوزەیران 1895</th></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ<br>قەڵەمی مەکتوب<br>ژمارە ۱۱۳۳<br>جەنابی عالی جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت<br>راگەیەندراوی بەندەمانە<br>کاتێك گەشتیارانی ئێران دەگەنە خانەقینی سەر سنووری ئێران، ئەم چەکانەی لە دەستیانە لێیان وەرگیراوە و لە گەرانەوەیان رادەستیان دەکرێتەوە، بۆ ئەم کارەش ئەگەرچی لە کاتی وەرگرتنی چەکەکان نووسراویان پێ دەدرێت و چاوپۆشی لە وەرگرتنی رسومات دەکریت، بەلام لە قوماندانیەتی ئالای زەبتیەی بەغداد رەزامەندی نیشان نەدراوە، وەرگرتنی روسوماتی نووسراو دووپاتکراوەتەوە، مەزبەتە لە ئەنجوومەنی کارگێری ویلایەتی بەغداد نووسراوی مێژووی ١٤ تشرینی دووەم ١٣١٠ پێشکەش کراوە، ئەمجارە لە ویلایەتی ناوهاتوو تەلەگرافنامە لە ١٦ مایس ١٣١١ دەرچووە، بە تێروانین لە ئاماژەی پێشوو، بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بەدەستەوەیە.</td></tr>
</table>



| 27 جەمادی یەکەم 1312/ 26 تشرینی دووەم 1894 | 000524.039286 | BEO |
|---|---|---|

بۆ رسوماتی ئەمانەتی شکۆدار
ئـەم داوایـەی لـە دژی سـەلیم کـوڕی چـراغ وەیـس قۆڵەکانـی کارگێـڕی رسـوماتی قـەزای خانەقیـن بـەرز کراوەتەوە، بـەڵام لـە کارگێـڕی ئەنجوومەنـی ویلایەتـی بەغـداد بڕیـار لەسـەر بـێ تـاوان بوونـی دراوە، لـە لایـەن نەزارەتـی رسـوماتی بەغـداد پێداچوونـەوەی بـۆ کـراوە، لەسـەر پەسـەندکردنی بڕیارەکـە لـە فەرمانگـەی دادگای شـورای دەوڵـەت رێکخـراوە و بـەرز کراوەتـەوە، ئـەو نووسراوەی بـە زانیارییـەوە لـە سـەرۆکایەتی شـورای شـکۆداری بـە وەکالەتـی ناوهاتـوو بـۆ سـەروو رەوان کـراوە، هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی.



| İ.DH | 01319.000046 | 4 شەعبان 1312/ 31 كانوونی دووەم 1895 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
٢١٧٩
جەنابی بە میهرەبانی ئەفەندم
دوای مردنی حەیدەری زادە لە شارۆچکەی خانەقین سەر بە ویلایەتی بەغداد، مولکەکەی لەلایەن میراتگرییەوە بە ناوی دەروێش ئەفەندی فرۆشراوە و دواتر لەسەر زەوییەکە بینایە دروست کراوە و ناوی حەمیدیەی لێنراوە، بۆ ئەنجامدانی مامەڵەی پێویست مەزبەتە لە فەرمانگەی ناوەخۆی شورای دەوڵەت رێکخراوە و هاوپێچ راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.
سەدری ئەعزەم و یاوەری



| 16 رەبیعی کۆتایی 1313/ 6 تشرینی یەکەم 1895 | 000688.051593 | BEO |
|---|---|---|
| بۆ لایەنی والآی سەر عەسکەر<br>لەسەر خانەنشین کردنی فارس ئاغا ئاغای تابووری سنووری خانەقین سەر بە ئالآی زەبتیەی ویلایەتی بەغداد، شوێنەکەی بە کراوەیی ماوەتەوە، لە شوێن ئەو حەسەن ئەفەندی بینباشی ژاندارمەی ئورفە، بۆ بینباشی ژاندارمەی ئورفەش حەسەن بەگ ئاغای تابووری گینج بە پلەی ئێستایان و بۆ ئاغای تابووری گینج ئەحمەد ئەفەندی یوزباشی بلۆکی سێیەمی تابووری سوارەی سەیارەی سەر بە ئالآی ژاندارمەی ویلایەتی ئەدرنە بە بەرز کردنەوەی پلەکەی بگوازرێنەوە و دابمەزرێن، بۆ ئەم مەبەستە لەسەر نووسراوی مێژووی ١٧ سەفەر ١٣١٣ ژمارە ٣١٠، فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت لە مێژووی ٨ رەبیعی کۆتایی ١٣١٣ رەزامەندی نیشان داوە، لە بارەی ئەحمەد ئەفەندیش فەرمانی عالی بۆ سەروو رەوان کراوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی. | | |




İ.HR.00349.00057.003

| İ.HR | 00349.00057 | 5 ره‌جه‌ب 1313/ 22 كانوونی یه‌كه‌م 1895 |
|---|---|---|
| بابی عالی<br>فەرمانگەی دەرەوە<br>قەڵەمی مەکتوب<br>وێنەی تەلەگرافنامەی مێژووی ٩ تشرینی دووەم ١٣١١ ی ویلایەتی بەغداد هاتووە<br>لـە ١٢ تشرینـی یەکـەم ١٣١١ باڵیـۆزی رووسـیا لـە بەغـداد بـە شـێوەیەکی کاتـی فەرمانبـەر دەنێرێتـە خانەقیـن، ئـەم فەرمانبـەرەش تایبەتـە بـە کاتـی هاتنـی گەشـتیاران، بـە گفتوگـۆ روون بۆتـەوە لـە فەرمانگـەی راگەیەنـدراوی پێشـوو تـکا کـراوە فەرمانـی رەزامەنـدی بدرێـت، فەرمـان. | | |



İ.HR.00349.00057.005

| İ.HR | 00349.00057 | 29 جەمادی کۆتایی 1313/ 17 کانوونی یەکەم 1895 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
١٥٤٠
جەنابی بە میهرەبانی ئەفەندم
گەشتیارێکی زۆری موسڵمان بەبێ پاسەپۆرت لە رووسیەوە دێن بۆ عەتەبات، بەڵام بە گوێرەی نیزامنامەی پاسەپۆرت مامەڵەیان لەگەڵ کراوە، لەلایەن باڵیۆزی رووسی لە بەغداد داواکراوە لە سنووری عوسمانی کە خانەقینە فەرمانبەرێك دابنرێت، ئەم فەرمانبەرەش بە شێوەیەکی کاتی تەنیا تایبەت دەبێت بە کاتی هاتنی گەشتیارەکان، لە ویلایەتی بەغدادی شکۆدار ٣ پارچە تەلەگرافنامە دەرچووە، بە رەوانە کردنی لەگەڵ نووسراوی نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.



| 8 رەبیعی یەکەم 1314/ 17 ئاب 1896 | 000828.062061 | BEO |
|---|---|---|

نەزارەتەکانی ناوەخۆ و دارایی شکۆدار
وێنەی نووسراو لە باڵا تۆمارکراوە، بۆ جێبەجێ کردنی ئاماژە دراوەتە نەزارەتی دارایی شکۆدار، لە نەزارەتی ناوەخۆی شکۆداریش هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.

ئەم گەشتیارە ئێرانیانەی بۆ سەردانی عەتەبەکانی عالی دێن، بە قەزای خانەقین تێدەپەڕن و ناسنامەی تێپەڕبوونیان لەلایەن ئەم فەرمانبەرانە ئەنجام دەدرێت کە دامەزراون، لە بارەی مووچەکانی ئەم فەرمانبەرانەش نووسراو کراوە.



BEO.000925.069337.001

<table>
<tr><td>BEO</td><td>000925.069337</td><td>23 شەوال 1314/ 27 مارت 1897</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ ویلایەتی بەغداد<br>لە قائیمقامیەتی خانەقین هەندێک ئەندامی عەشیرەتەکانی ئێران لەگەڵ عەزیز خان هەڵاتوون و هاتوونەتە ئێرە و بە کاری تاوان خەریکن، بۆیە قائیمقامی ناوبراو دووربخرێتەوە، هەروەها عەزیز خان و هاوەڵانی رادەستی ئێران بکرێنەوە، پەیوەندی بە بە باڵیۆزخانەی ئێران بکرێت و زانیاری رابگەیەندرێت.</td></tr>
</table>



| 10 زیلقەعدە 1314/ 12 نیسان 1897 | 000933.069969 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی نافیعەی شکۆدار
کاری دروست کردنی شەقامێك داپۆشراو بە قوم و بەرد، لە خانەقین بۆ بەغداد تا مەشهەد دراوەتە مۆسیۆ موراڵ، دوای گەرانەوە بۆ نەزارەتی شکۆدار، لەلایەن تەرنۆ بەگ بەرێوەبەری گشتی کۆمپانیای تەرقوس سو و کۆمپانیای سیگۆرتەی عوسمانی داواکاری بەرز کراوەتەوە، بە تێروانین لە بابەتەکە هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.



BEO.000936.070187.001

| 17 زیلقەعدە 1314/ 19 نیسان 1897 | 000936.070187 | BEO |
|---|---|---|

بۆ ویلایەتی بەغداد شیفرە
هەندێك كەس لە خانەقین سنووریان بەزاندووە و تاوانی كوشتن و هێرشیان ئەنجام داوە، قائیمقامی قەزاش هانی داون و چەكی بەسەریان دابەش كردووە، لەگەڵ راگەیاندنی باڵیۆزی ئێران، سەرپێچی كەران تەمبێ بكرێن و قائیمقام لە ئەركەكەی دوور بخرێتەوە، رێگە نەدرێت ئەم ماوەیە لە سنووری ئێران گەندەڵی و سكاڵای حكوومەتی ئێران ئەنجام بدرێت، بە تێروانین لەم بابەتە لێكۆڵینەوە ئەنجام بدرێت و ئامادەكاری بكرێت، بۆ ئەمەش ئاماژە و ئامۆژگاری بدرێت.



İ.AS.00016.00059.003

| 7 سەفەر 1314/ 18 تەمموز 1896 | 00016.00059 | İ.AS |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
٤٨٠
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
ئاغای تابوور فارس ئاغای شارەزووری لە تابووری سنووری خانەقین سەر بە ئاڵای زەبتیەی ویلایەتی بەغداد، مەرکەزی دەرماڵەی فەرمانگەی ژاندارمە بە کراوەیی ماوەتەوە، بۆ ڕێکخستنی زیادە لە پارەوپولی سەنجەقی بەغداد ٥٠٥ قوروش مووچەی خانەنشینیەکەی بە نووسراوی سەرعەسکەری پایەبەرز ڕاگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا بڕیار و فەرمانی هومایۆن جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت چ بێت جێبەجێ دەکرێت، بە ڕاگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.
سەدری ئەعزەم




بغداد ولايتى

٨١

106/56

İ.TAL. 1314/C-56

1

İ.TAL.00106.00056.001

| **İ.TAL** | 00106.00056 | **22 رەبیعی کۆتایی 1314/ 30 ئەیلوول 1896** |
| --- | --- | --- |

ویلایەتی بەغداد

٨١

نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار

جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم

لەلایـەن دەوڵەتـی ئێرانـەوە بـاش کاتیبـی کارگێـری کەرەنتینـە مسـتەفا ئەفەنـدی و فەرمانبـەری پشـکنینی تـەرم مـەردان ئەفەنـدی، لـە پلـەی چـوارەم شـیر و نیشـانی خورشـیدیان پـێ دراوە، لـە قائیمقامیەتـی خانەقیـن ئاماژەی پێکـراوە، نیشـانەکەیان قەبـوڵ کـردووە و لـە بـارەی دەسـتەواژەی ناوبـراوان جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا هاتـووە، لـەم بابەتـەدا بریـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەم کەسـەیە کـە فەرمانـی بـە دەسـتەوەیە.

مۆری محەمەد عەتاڵڵا والی بەغداد




İ.TAL.00106.00056.003

| 5 جەمادی کۆتایی 1314/ 11 تشرینی دووەم 1896 | 00106.00056 | İ.TAL |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
١٨٨٩
جەنابی بە میهرەبانی ئەفەندم
لەلایەن دەوڵەتی ئێرانەوە لە پلەی چوارەم شیر و نیشانی خورشید دراوەتە باش کاتیبی کەرەنتینەی خانەقین مستەفا ئەفەندی و فەرمانبەری پشکنین مەردان ئەفەندی، لەلایەن ناوبراوانەوەش قەبوڵ کراوە، لە بارەی دەستەواژەکانیشیانەوە نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار بە هاوپێچ راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.




İ.DH.01336

<table>
<tr><td>İ.DH</td><td>01336.000026</td><td>12 سەفەر 1314/ 23 تەمموز 1896</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەت<br>دیوانی هومایۆنی ئێستا<br>٥٥٥<br>جەنابی بە میهرەبانی ئەفەندم<br>قائیمقامی مەندەلی نەشئەت ئەفەندی داوای کردووە ئەرکەکەی بگوازرێتەوە قائیمقامیەتی قەزای خانەقین سەر بە ویلایەتی بەغداد، هەروەها بۆ قائیمقامیەتی مەندەلی لە چینی سێیەم هەڵبژێردراو و ئاشنا لە زمانی ناوچەکە بەڕێوەبەری پێشووی کوفە سابت ئەفەندی دامەزرێت، بۆ سوێندخواردن و دامەزراندنی ناوبراوان لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران مەزبەتە ڕێکخراوە و بە هاوپێچەوە ڕەوان کراوە، نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆی شکۆداریش ڕاگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە ڕاگەیاندنی نووسراو کراوە.</td></tr>
</table>




İ.AS.00020.00069.004

<table dir="rtl">
<tr><td>İ.AS</td><td>00020.00069</td><td>3 زیلحیجە 1314/ 5 مایس 1897</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەت<br>دیوانی هومایۆنی ئێستا<br>٣٤٣٢<br>جەنابی بە میهرەبانی ئەفەندم<br>ئەم گەشتیارانەی هەموو ساڵ لە ئێران و هیندستان و شوێنەکانی دونیا دێنە کەربەلا، پاراستنیان بە پێی پێویست نییە، لەسەر ئاماژەی ناوەخۆ ئاغای تابوور حەسەن عەونی ئەفەندی لە تابووری کەربەلا سەر بە ئالای زەبتیەی ویلایەتی بەغداد لەگەڵ حەسەن ئەفەندی ئاغای تابووری سەر سنووری خانەقین گۆرینەوە بە ئەرکەکانیان بکرێت، بۆ ئەم مەبەستە مەزبەتەی رێکخراوی فەرمانگەی ژاندارمە و تۆماری وەرگێردراوی کەسێتی رەوان کراوە، لەگەڵ نووسراوی سەرووی سەر عەسکەر بە هاوپێچەوە راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە بریار و فەرمانی هومایۆن چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.</td></tr>
</table>




İ.AS.00020.00010.002

| İ.AS | 00020.00010 | 14 شەوال 1314/ 18 مارت 1897 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
٢٩٩٦
جەنابی بە میهرەبانی ئەفەندم
بەهـۆی زریانـی رووبـاری ئەلوەنـد قشـڵەی تابـووری شەشـەمی سـەر سـنووری خانەقیـن سـەر بـە ئـاڵای زەبتیـەی ویلایەتـی بەغـداد وێـران بـووە، بـۆ نۆژەنکردنـەوە لـە دەرخسـتە و کەمکردنـەوەدا ١٥,٧٣ قـوروش و ٣٠ پـارە لـە ژێـر بەرێوەبەرایەتـی نەزارەتـی قۆمیسـیۆن نـۆژەن بکرێتـەوە، بـرە پـارەی دیاریکـراو لـە دەرماڵـەی پەسـەند کـراوی سـاڵی ١٣١٢ ی ژاندارمـەی گشـتی بـە نـاوی رێکخسـتنی دروسـت کـردن و نۆژەنکردنـەوەی شـار هەژمـار بکرێـت و لـە پارەوپولـی گشـتی بـە سـەنەدی تایبـەت کارەکـە جێبەجـێ بکرێـت، بـە نـووسراوی سـەرووی سـەر عەسـکەر بـە هاوپێچـەوە راگەیەنـدراوە و پیشـکەش کـراوە، لـەم بابەتـەدا جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمـان پاشـا چ بفەرمووێـت جێبەجـێ دەکرێـت، بـە راگەیاندنـی نـووسراو کـراوە ئەفەنـدم.



BEO.001052.078887.001

| 18 رەجەب 1315/ 13 کانوونی یەکەم 1897 | 001052.078887 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
قائیمقامیەتی قەزای خانەقین سەر بە ویلایەتی بەغداد بە بەتاڵی ماوەتەوە، لەسەر نووسراوی ٢٢ تشرینی یەکەم ١٣١٣ مستەفا سالم ئەفەندی قائیمقامی قەزای عەمادیە ئەرکەکەی گوازراوەتەوە، بە بریاری قۆمیسیۆنی مولکیە لە مێژووی ٢٥ تشرینی دووەم ١٣١٣ بە فەرمانی پاشا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت رەزامەندی نیشان داوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.



| BEO | 001035.077574 | 11 جەمادی کۆتایی 1315/ 7 تشرینی دووەم 1897 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
لـە ویلایەتـی بەغـداد قائیمقامیەتـی قـەزای شـامیە بـە بەتاڵـی ماوەتـەوە، نەشـئەت ئەفەنـدی قائیمقامـی خانەقیـن بگوازرێتـەوە و دابمەزرێـت، بـۆ ئـەم مەبەسـتە لەسـەر نـووسراوی ٣٠ ئـاب ١٣١٣ ژمـارە ٢٣٩٩ بـە بڕیـاری قۆمیسـیۆنی مولکیـە جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت، بـە فەرمانـی پاشـا ڕەزامەنـدی نیشـان داوە، هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی.



| 2 رەبیعی کۆتایی 1315/ 31 ئاب 1897 | 001001.075006 | BEO |
|---|---|---|
| بۆ لایەنی والای سەرعەسکەر<br>فارس نادر ئاغای تابووری خانەقین خانەنشین کراوە، بە واژووی ناوبراو تەلەگرافنامە هاتووە، لە بارەی بەکارهێنان و بە کارنەهێنانی ناوبراو فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت دەرچووە، بۆ ئەم کارەش بە نووسراو لە باش کیتابەتی مابەینی هومایۆنی شکۆدار ئاگاداری دەرچووە. | | |

BEO.000999.074881.004

| BEO | 000999.074881 | 16 ڕەبیعی یەکەم 1315/ 15 ئاب 1897 |
| --- | --- | --- |
| بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەتی پایەبەرز<br>ژووری تەلەگراف<br>شیفرەی تەلەگرافنامەی ویلایەتی بەغداد<br>بەهۆی بێ توانای و لێنەهاتوویی قائیمقامی خانەقین نەشئەت ئەفەندی، کەسێکی لێهاتوو لە شوێن ناوبراو دابمەزرێت، لە وەڵام تەلەگرافنامەی بە شیفرەی ٣١ مایس ١٣١٣ ڕاگەیەندراوە، لەبەر ئەوەی قەزای ناوبراو دەکەوێتە سەر سنوور و لە ڕووی جوگرافیاوە گرنگە و هەستیارە، بە درێژایی کات گونجاو نییە بە وەکالەت بەڕێوەبچێت، بەپەلە چارەسەرێك بدۆزرێتەوە، بە فەرمانی پەیوەندیداری سەدارەت جێبەجێ بکرێت.<br>والی عەتاڵڵا | | |



| 9 رەجەب 1315/ 4 كانوونی یەكەم 1897 | 01351.000056 | İ.DH |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
١٩٣٧
بۆ گواستنەوەی قائیمقامی قەزای عەمادیە مستەفا سالم ئەفەندی و دامەزراندنی لە قائیمقامیەتی قەزای خانەقین، نووسراو كراوە و مەزبەتەی فەرمانبەرانی مولكیە راگەیەندراوە و پێشكەش كراوە، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرموویت جێبەجێ دەكرێت، بە راگەیاندنی نووسراو كراوە ئەفەندم.

سەدری ئەعزەم



باش کتابت دائرەسی
٣٥١٢


İ.HUS.00056.00005.001

| İ.HUS | 00056.00005 | 1 رەبیعی کۆتایی 1315/ 30 ئاب 1897 |
|---|---|---|

کۆشکی یڵدزی هومایۆن
فەرمانگەی باش کیتابەت
٣٥١٢
لەسەر داواکاری بە واژووی خانەنشین کراو ئاغای تابووری خانەقین فارس نادر، تەلەگرافنامە رەوان کراوە، ئەگەر خانەنشینی ناوبراو گونجاویش بێت بەڵام دەتوانرێت لە شوێنێکی تر بەکار بهێنرێتەوە، بۆ ئەم مەبەستەش جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بە دەستەوەیە.
سەرکاتیب ........




١١٧٩٢



İ.HUS.00061.00074.001

| İ.HUS | 00061.00074 | 23 ڕەمەزان 1315/ 15 شوبات 1898 |
|---|---|---|

کۆشکی یڵدزی هومایۆن
فەرمانگەی باش کیتابەت
١١٧٩٢

مامەڵـەی خانەنشـینیەکەی جێبەجـێ کـراوە، کەچـی ڕاگەیەنـدراوە حاڵـی حـازر لـە ئەرکـی سـەربازی ئامادەیـە و خۆراگـر و لێهاتـووە، بۆیـە داواکـراوە دووبـارە پلـەی ئاغـای تابـووری پێ بدرێـت، تەلەگرافنامەی فارسـی بـە واژووی ئاغـای تابـووری پێشـووی سـەر سـنووری خانەقیـن دەرچـووە، بـە گوێـرەی یاسـای سـەربازی ئەگـەر بێتـو چالاکـی خراپـی پێشـووی نەبێـت دووبـارە بـەکار هێنانـەوەی گونجـاوە، فەرمانـی جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت جێبەجـێ بکرێـت، لـەم بابەتـەدا بریـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەم کەسـەیە کـە فەرمانـی بەدەسـتەوەیە.
جەنابی سەر کاتیب



| 27 زیلقەعدە 1316/ 8 نیسان 1899 | 001294.097007 | BEO |
|---|---|---|

بۆ لایەنی واڵای سەر عەسکەر و نەزارەتی دارایی سەروو
وێنـەی نـووسراو لـە بـاڵا تۆمـار کـراوە، بـۆ جێبەجـێ کردنـی کارەکـە ئامـاژە دراوەتـە نەزارەتـی دارایـی سـەروو، لەلایەنـی واڵای سـەر عەسـکەر بریـار لەسـەر جێبەجێکردنـی دراوە.
ئـەم قشـلەیەی مەرکەزەکـەی تابـووری شەشـەمی خانەقیـن سـەر بـە ئـاڵای زەبتیـەی ویلایەتـی بەغـدادە، بـە تەخمینـی نۆژەنکردنـەوەی بـاس کـراوە.



| 1 سەفەر 1316/ 21 حوزەیران 1898 | 001149.086128 | BEO |
| --- | --- | --- |

تەلەگرافنامە
بۆ ویلایەتی بەغداد
هاوپێچ ٧ حوزەیران ١٣١٤ لە بارەی تەرەکەی عەبدولرەزاق، بە واژووی جرجیس و هاوەڵانی لە مەرکەزی خانەقین تەلەگرافنامە لە ٧ حوزەیران دەرچووە، وێنەیەکی هێنراوە و خوێندنەوەی بۆ کراوە، بە پێی ئاماژەی پێشوو ئەوەی پێویستە ئەنجام بدرێت و کاری ئەم تەرەکەیە بگاتە ئەنجامێک.


BEO.001245.093337.001

| 5 شەعبان 1316/ 19 کانوونی یەکەم 1898 | 001245.093337 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
لە عەشیرەتی گۆران کوڕی نیاز خان بە ناوی نیعمەتوڵلا خان لەگەڵ ٤٢ هاوەڵی، هاتۆتە خانەقین و مولکەکانی خۆی دەست بەسەرکردۆتەوە، بەڵام لەلایەن حکوومەت بەهەند وەرنەگیراوە، بەم شێوەیەش مافی خوراوە، جەنابی لە پەیوەندیداری خەلافەت پاراوەتەوە، بە موشیرەتی لەشکری شەشەمی شکۆدار ڕاگەیەندراوە، ئەمجارە لەلایەن والای سەر عەسکەر ئاماژە و لەلایەن سەرعەسکەری ناوهاتوو نووسراو هاتووە و لە ٢٨ تشرینی دووەم ١٣١٤ حەواڵەی نەزارەتی شکۆدار کراوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.



BEO.001245.093308.001

| BEO | 001245.093308 | 7 شەعبان 1316/ 21 کانوونی یەکەم 1898 |
|---|---|---|

تەلەگرافنامە بۆ ویلایەتی بەغداد
لە ٦ کانوونی یەکەم ١٣١٤، ئەم تەلەگرافنامانەی پەیوەستە بە نیعمەتوڵڵاخان بە نەزارەتی دەرەوە ڕاگەیەندراوە، مەبەستی ناوبراو لە هاتنی بۆ خانەقین بۆ بەدەستەوەگرتنی مولکەکانیەتی، تکای لە پەیوەندیداری خەلافەتیش کردووە کاری بۆ بکرێت، لە کۆتاییدا بەلایەنی سەر عەسکەر ڕاگەیەندراوە، بۆ جێبەجێ کردنی کارەکەش پەیوەندی بە نەزارەتی ناوخۆ کراوە.




| BEO | 001394.104494 | 27 جەمادی کۆتایی 1317/ 2 تشرینی دووەم 1899 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دارایی سەروو
بە فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت شوێنی ئالای ٣٤ی سوارەی خانەقین لەگەڵ ئالای ٣٦ی سوارەی کەرکووك بگۆردرێت، بەڵام ئالای ٣٦ی سوارەی کەرکووك ٧١ ئاژەڵیان هەیە، بۆ ئەوەی بگاتە ٢٠٠ ئاژەڵ پێویست بە ٤٠٠٠ لیرە دەکات، لە بودجەی ئەم ساڵەدا تۆمار بکرێت و ڕەزامەندی خەرج کردنی بدرێت، بە تێروانین لە نووسراوی سەر عەسکەر لە مێژووی ٢٥ جەمادی کۆتایی ١٣١٧ ژمارە ٧١٨ دەرچووە، کارەکە جێبەجێ بکرێت و نووسراوەکە ڕەوان بکرێتەوە.



| 11 جەمادی یەکەم 1317/ 17 ئەیلوول 1899 | 001373.102934 | **BEO** |
|---|---|---|
| بۆ لایەنی واڵای سەر عەسکەر<br>لەسەر ئەم سکاڵایانەی لە دژی میری ئاڵای تۆفیق بەگ لە ئاڵای ٣٤ی سوارەی خانەقین بەرز کراوەتەوە، بە واژووی سەعید و هاوەڵانی لە ئەندامانی ئەنجوومەنی کارگێری بۆ ناوچەی ناوهاتوو تەلەگرافنامە دەرچووە، بە تێروانین لە بابەتەکە دواى لێکۆڵینەوە کارەکە جێبەجێ بکرێت. | | |



| 9 رەبیعی کۆتایی 1317/ 17 ئاب 1899 | 001358.101782 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
وێنەکانی راگەیەندراو لە باڵا تۆمار کراوە، لەگەڵ برە پارەکە لە پەراوێزی نووسراوی فەرمانی پاشای پەیوەندیداری خەلافەت نووسراوەتەوە و هاوپێچ دەرخستەکە گەڕێندراوەتەوە، بە گوێرەی کەمکردنەوەکە داوا لە نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار کراوە هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.

جەنابی بەویژدانی ئەفەندم
لەسەر وێران بوونی تەلەگرافخانەی خانەقین دوای کەمکردنەوە، نۆژەنکردنەوەکەی ٧,٨٠٠ قوروشی پێویستە و برە پارەی ناوهاتوو لە رێکخستنی نۆژەنکردنەوەی بینایەکانی ئەم ساڵەدا رێك دەخرێت، بۆ ئەمەش لە نووسراو حەواڵەی نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار کراوە، لەگەڵ هاوپێچ مەزبەتەی فەرمانگەی دارایی شورای دەوڵەت راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.



İ.PT.00010.00020.003

| 3 ڕەبیعی کۆتایی 1317/ 11 ئاب 1899 | 00010.00020 | İ.PT |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
٩٥٦
جەنابی بە میهرەبانی ئەفەندم
لەسەر وێران بوونی تەلەگرافخانەی خانەقین دوای کەمکردنەوە، نۆژەنکردنەوەی بە بڕی ٧٨٠٠ قوروش دیاریکراوە، بڕە پارەی دیاریکراو لە ڕێکخستنی نۆژەنکردنەوەی بینایەی ئەم ساڵەدا دابین دەکرێت، بۆ ئەم مەبەستەش نووسراو حەواڵەی نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار کراوە، مەزبەتەی فەرمانگەی دارایی شورای دەوڵەت بە هاوپێچەوە ڕاگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە ڕاگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.



| 12 شەوال 1318/ 2 شوبات 1901 | 001613.120963 | BEO |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>ئەندامانی تابووری شەشەمی خانەقین سەر بە ئالآی زەبتیەی ویلایەتی بەغداد کە لە سنووری ئێران بەکاردێت، لە تاقمێك کەسانی بکوژ و درندە و سەربازانی هەڵاتوو و ئێرانیەکان پێك دێن، لە ئەنجام زیان بە دەوڵەتی عوسمانی دەگەیەنن، راگەیەندراوە تابووری ناوبراو هەڵبوەشێتەوە و لەگەڵ دەرماڵەی ساڵانەی ئاژەڵەکانی ئالآی ٣٥ی سوارە و ئالآی شەشەم کە هەر یەکە ٤٠٠ سەرئاژەڵ دەکات، هەروەها مەرکەزی ئالآی ٣٦ لە خانەقین و مەرکەزی ئالآی ٣٥ لە مەندەلی جێگیر بکرێت، لەگەڵ ئەمەش قەدەغەکردنی سەرپێچی عەشیرەتەکانی ئێران و سودی خەزینە دڵنیا بکرێتەوە، بە تێروانین لە نوسراوی مێژووی ٨ شەوال ١٣١٨ ژمارە ١٥٧٠ ی سەر عەسکەر، پەیوەندی بە ویلایەت بکرێت و بە گوێرەی وەڵام و خوێندنەوەی عالی بۆ بابەتەکە، رابگەیەندرێت و نووسراوەکە رەوان بکرێتەوە. | | |



| BEO | 001600.119991 | 2 رەمەزان 1318/ 24 کانوونی یەکەم 1900 |
|---|---|---|

بۆ ویلایەتی بەغداد
عەشیرەتی جاف، ناوچەکانی سەرتاق و هەندێك تائیفەکانی گۆرانی تاڵان و دەست بەسەر کردووە، هەروەها عەلی ئەکبەر خان لەلایەنی خانەقین نیشتەجێ کراوە، بۆ گەرانەوەی دوو کوڕی فەرەح خان و هەندێك لە هەڵاتووان و کەلوپەلە تاڵانکراوەکانیش ئامادەکاری کراوە، بەڵام سەرپێچی و هێرش و هەندێك عەشیرەتی سوارە سنووریان بەزاندووە و کەلوپەلی جوتیارانی ئێرانیان تاڵان کردووە، لە باڵیۆزی ئێران راگەیەندراوە، ئەگەر سکاڵای حاڵی حازر راستیش بێت تاڵانکراوەکان رادەست بکرێتەوە.



BEO.001518.113844.001

| 18 ڕەبیعی یەکەم 1318/ 16 تەمموز 1900 | 001518.113844 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
لەلایەن حکوومەتی ئێرانەوە ئەحمەد ئەفەندی باش کاتیبی کارگێری کەرەنتینەی بەغداد و عەبدوڵڵا ئەفەندی بەڕێوەبەری ناحیەی قزلربات و تاشجان ئەفەندی پزیشکی کەرەنتینەی خانەقین و نوری ئەفەندی کاتیبی یەکەمی کەرەنتینەی بەغداد، شیر و پلەی چوارەم و پێنچەم و نیشانی خورشیدیان پێدراوە، لەسەر نووسراوی ٣ ڕەبیعی یەکەم ١٣١٨ ژمارە ١٦٢١ بە ڕەزامەندی جەنابی پاشا هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.



BEO.001508.113074.003

<table>
<tr><th>BEO</th><th>001508.113074</th><th>21 موحەررەم 1318/ 21 مایس 1900</th></tr>
<tr><td colspan="3">پایەی سەر عەسکەر<br>فەرمانگەی ژمێریاری<br>١٧٦<br>راگەیەندراوی بەندەمانە<br>بە سەنەد شوێنگرەوەی ئەم ئەرزاقەی دراوەتە سەربازانی شاهانەی خانەقین، بە گشتی ٤٠٠٠٠ قوروش دەکات، بەڵام بێ سوود بووە، دەفتەرداری بەغدادیش واهیب ئەفەندی هەندێك سەرنج و تێبینی لەسەر بووە و بە واژووی داواکار محەمەد ساڵح تەلەگرافنامە لە بەغداد هاتووە، وێنەی دەرچووی هاوپێچ پێشکەش کراوە، بە هۆی دواکەوتنی رێکخستنی داواکاریەکان رێگەنەدرێت کێشە رووبدات، ئەنجام و زانیاری بدرێتە لایەنی پەیوەندیدار و لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بدرێتە ئەو کەسەی کە فەرمانی بەدەستەوەیە.<br>رزا سەرعەسکەر</td></tr>
</table>

BEO.001508.113074.001

| 27 سەفەر 1318/ 26 حوزەیران 1900 | 001508.113074 | BEO |
|---|---|---|

بۆ لایەنی واڵای سەر عەسکەر
داوا کراوە محەمەد ساڵح هەشت یەکی ئەرزاقی سەربازی شاهانەی خانەقین ئامادە بکات و بیدات، هەژمارەکەی حەواڵەکردنی بۆ کراوە و بەبێ دواکەوتن جێبەجێ بکرێت، بۆ ئەم مەبەستەش بە دڵنیاییەوە تەلەگراف دراوەتە دەرفتەرداری بەغداد، لەسەر نووسراوی ٢١ موحەرەم ١٣١٨ ژمارە ١٧٦ ی سەر عەسکەر، وەڵامی نەزارەتی دارایی ئاماژەی پێکراوە.



BEO.001497.112246.001

| 5 سەفەر 1318/ 4 حوزەیران 1900 | 001497.112246 | BEO |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی بازرگانی و نافیعەی شکۆدار<br>بـۆ تـەواو بوونـی ڕێـگای خانەقیـن بـۆ بەغداد-کەربـەلا، هەروەهـا لـە وان بـۆ نەجـەف، لـە مێـژووی ٢٤ جەمـادی یەکـەم ١٢٩٨ خاوەنداریەتـی پێـدراوە، بـەڵام لەسـەر هەندێـك ووتـە و داواکاری بـە واژوو و مـۆری پاچەچـی زادە عەبدولرەحـمان دانیشـتووی بەغـداد پێشـکەش کـراوە، مەغدوربوونـی دەرکەوتـووە، بـە تیروانیـن و ووردبینـی زانیـاری نەزارەتـی دارایـی شـکۆدار هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی. | | |

BEO.001496.112179.001

| 4 سەفەر 1318/ 3 حوزەیران 1900 | 001496.112179 | BEO |
| --- | --- | --- |

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
مستەفا سالم ئەفەندی قائیمقامی قەزای خانەقین لەگەڵ عەبدوڵلا بەگ قائیمقامی هەولێر گۆرینەوەیان پێ بکرێت، بۆ ئەم مەبەستە لەسەر نووسراوی ١٥ زیلحیجە ١٣١٧ ژمارە ٤٣٣ بە بریاری قۆمیسیۆنی مولکیە، لە مێژووی ١ سەفەر ١٣١٨ فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت رەزامەندی نیشان داوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.



| İ.DH | 01375.0000006 | 6 موحەررەم 1318/ 6 مایس 1900 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
٥٦
جەنابی بە میهرەبانی ئەفەندم
مستەفا سالم ئەفەندی قائیمقامی قەزای خانەقین سەر بە ویلایەتی بەغداد لەگەڵ عەبدوڵڵا بەگ قائیمقامی هەولێر سەر بە ویلایەتی موسڵ گۆڕینەوەیان پێ بکرێت، بۆ ئەم مەبەستە مەزبەتەی قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە کە دراوەتە قەڵەم لەگەڵ نووسراو و وەرگێردراوی وێنەی زانیاری کەسێتی نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار بەیەکەوە راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.




BEO.001653.123912.001

| BEO | 001653.123912 | 10 موحەررەم 1319/ 29 نیسان 1901 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دارایی شکۆدار

بۆ نۆژەنکردنەوەی ئەم قەڵا و منارانەی لە ژێر کارگێری تابووری شەشەمی خانەقین سەر بە ئاڵای زەبتیەی ویلایەتی بووە، بری ٣٠،٩٧٧ قوروش لە رێکخستنی دروست کردن و نۆژەنکردنەوەی شار دابین بکرێت، بۆ ئەمەش فەرمانی پاشای ١٨ زیلقەعدە ١٣١٧ فەرمووەیەتی و بە دەوڵەت راگەیەندراوە، بەڵام لەبەر ئەوەی حەواڵەنامەی برە پارەی ناوهاتوو نەهاتووە بۆیە رادەستکردنی گونجاو نییە، هەرچی زووە پێویستە قەڵا و منارەکانی ناوهاتووش نۆژەن بکرێتەوە، هەروەها هەرچی زووە برە پارەی ناوهاتوو لە پارەی ساڵی ١٣١٧ رێك بخرێت، لە شەش مانگی یەکەمی ساڵی ناوهاتوو حەواڵە نامەکەی رەوان بکرێت، بە ئاماژەی ویلایەتی بەغداد بۆ لایەنی واڵای سەر عەسکەر رەوان کراوە، بەم تێروانینە هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی کارەکە.





BEO.001959.146899.001

| BEO | 001959.146899 | 4 ڕەمەزان 1320/ 5 کانوونی یەکەم 1902 |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>وێنەی نووسراو لە باڵادا تۆمار کراوە، لە نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار جێبەجێ بکرێت.<br><br>بـۆ لێکۆڵینـەوە لـە هەندێـك بابەتـی تایبـەت بـە عەشـیرەتەکانی قـەزای خانەقیـن، فەرمانبـەر ڕەوان کـراوە، بـۆ ئەمـەش خەرجـی ڕێگایـان پـێ دەدرێـت. | | |


BEO.002001.150053.001

| 17 زیلقەعدە 1320 /15 شوبات 1903 | 002001.150053 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار نووسراو
ئەندامانی سەربازی مۆسیقی لە ناوچەی زوای ئێران پەرشوبڵاوبوونەتەوە و دوای هەڵاتن هاتوونەتە ناو خاکی دەوڵەتی عوسمانی، ٣٠ ئەندام لەلایەن جەنابی پاشا بە ڕێزەوە پارێزراون، هەروەها لە قائیمقامیەتی سوارەی خانەقین راگەیەندراوە، لە نووسراوی ١٣ زیلقەعدە ١٣٢٠ ژمارە ٢٩٥٦ ی سەر عەسکەر ئاماژەی پێکراوە ئەندامانی ناوهاتوو چ جۆرە مامەڵەیەکیان لەگەڵ بکرێت، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردن و گەرانەوەی هاوپێچەکان.



DH.ŞFR.00682.00060.001

| 27 زیلقەعدە 1320 /25 شوبات 1903 | 00682.00060 | DH.AFR. |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
هاوپێچی تەلەگرافنامەی مێژووی ٢٦ کانوونی دووەم ١٣١٨، ئەندامی مۆسیقی ئێران گەراونەتەوە شوێنی خۆیان، لەسەر ئاماژەی قائیمقامیەتی خانەقین راگەیەندراوە.
فەیزی وەکیلی موشیر و والی بەغداد




DH.ŞFR.00682.00019.001

| DH.AFR | 00682.00019 | 19 زیلقەعدە 1320 /17 شوبات 1903 |
| --- | --- | --- |

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار

ئـەو کانـزا نەوتیـەی ئینگلیـزەکان دۆزیویانەتـەوە، نزیکـە لـە قـەسر و سـەرپیل و قورەنتـو و هەندێـك ناوچـەی تـر کـە لـە ژێـر دەسـەڵاتی عەشـیرەتەکانی ئێرانـە، بۆیـە لـە هـەر ناوچەیـەك نەفەرێکـی ئینگلیـز دانـراوە، لـە قائیمقامیەتـی خانەقیـن راگەیەنـدراوە، بـۆ زانینـی هـۆکاری ئـەم کارە، لێکۆڵینـەوە ئەنجـام بدرێـت و ئـەم وەڵامـەی وەردەگیرێـت رابگەیەندرێـت.

فەیزی وەکیلی موشیر و والی




DH.ŞFR.00682.00067.001

<table dir="rtl">
<tr><th>DH.AFR</th><th>00682.00067</th><th>29 زیلقەعدە 1320/ 27 شوبات 1903</th></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>لە مێژووی ٣٠ کانوونی دووەم ١٣١٨ ئەو ئەسڵزادەیەی ئینگلتەرا کە لە موسڵ بۆ بەغداد دێت، دوای برینی وێرانەکانی بابل بە رێگەی خانەقین دەچێتە ئێران، راگەیەندراوە ئەمرۆ لە بەغداد جولەی کردووە.<br>موشیری لەشکری شەشەمی هومایۆن والی بەغداد ...........</td></tr>
</table>


T.C. BAŞKANLIK OSMANLI ARŞİVİ (BOA)

تلغرافنامه

OSMANLI ARŞİVİ
DH.ŞFR 682 16

DH.ŞFR.00682.00016.001

<table>
<tr><td>DH.AFR</td><td>00682.00016</td><td>19 زیلقەعدە 1320/ 17 شوبات 1903</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>دوپس لە فەرمانبەرانی ئینگلتەرا-هیندستان، بە داواکردنی حەلەب لە ٢٧ کانوونی دووەم ١٣١٨ هاتۆتە بەغداد، دواتر لە ڕێگەی خانەقین دەچێتە کرمانشا، ڕاگەیەندراوە ئەمڕۆ لە بەغداد جولە دەکات.<br>فەیزی وەکیلی موشیر و والی</td></tr>
</table>



| BEO | 002266.169906 | 12 زیلقەعدە 1321/ 30 کانوونی دووەم 1904 |
|---|---|---|

بۆ لایەنی والای سەر عەسکەر
ئاغای تابوور ئیسماعیل بەگ لە تابووری عەمارە سەر بە ئالای زەبتیەی ویلایەتی بەسرا، ئێستا بە شێوەیەکی کاتی ئاغای تابووری مونتەفیکە، بە ئاغای تابووری خانەقین دامەزرێت، لە شوێن ئەویش ئاغای تابووری کەرکووك سادق ئاغا لە تابووری ئێسترسوارەی سێیەمی ئالای زەبتیەی بەغداد دەست بە کار بن، بۆ ئەم مەبەستە لەسەر نووسراوی ١ زیلقەعدە ١٣٢١ ژمارە ١٤٣٨ و نووسراوی رەزامەندی ١٠ زیلقەعدە ١٣٢١ ی فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت دەرچووە.




BEO.002229.167170.001

| BEO | 002229.167170 | 12 رەمەزان 1321/ 2 کانوونی دووەم 1903 |
|---|---|---|
| بۆ ویلایەتەکانی بەسرا و بەغداد<br>سارتور هار دینغ باڵیۆزی دەوڵەتی ئینگلتەرا لە تەهران لەگەڵ هاوکارەکەی، لە ڕێگەی ئەهواز بۆ بەسرا ڕۆیشتووە و لە کاتی گەڕانەوەی بۆ ئێران لە ڕێگەی بەغداد و خانەقین، ئەو کەلوپەلانەی لەلایانە بەبێ ڕسومات و باج لە گومرگ بپەڕنەوە، بۆ ئەمەش ئاگاداری دراوەتە ئەمانەتی ڕسومات و ویلایەتی بەغداد. | | |



| BEO | 002176.163159 | 29 جەمادی کۆتایی 1321/ 22 ئەیلوول 1903 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دارایی شکۆدار
بـۆ نۆژەنکردنـەوەی منـارە وێرانبووەکانـی سـنووری خانەقیـن، لـە دارایـی سـاڵی ٣١٧ خەرجـی ڕێکخـراوە، بـۆ حەواڵەکردنـی ٣٩٧٧ قوروشـیش، لـە پاشـکۆی ئـەم سـاڵدا گونجـاو نییـە، پێـش هاتنـی وەرزی زسـتان منـارەکان نـۆژەن بکرێنـەوە، پێویسـتە لـە دارایـی سـاڵی ٣١٩ بدرێـت و لـە قوماندانـی ئـاڵای زەبتیـەی ویلایەتـی بەغـداد ئامـاژەی پێکـراوە، نـووسراوی سـەر عەسـکەر لـە ٢٧ جەمـادی کۆتایـی ١٣٢١ ژمـارە ٩٣٣ هاوپێـچ بـۆ سـەروو بـەرز کراوەتـەوە، بەپەلـە جێبەجـێ بکرێـت و ئەنجامەکـەی ڕابگەیەندرێـت.




A.}MKT.MHM.00583.00005.013

<table>
<tr><td>A.MKT.MHM</td><td>00583.00005</td><td>25 ڕەبیعی کۆتایی 1321/ 21 تەمموز 1903</td></tr>
<tr><td colspan="3">نەزارەتی تەندروستی شکۆدار<br>وەڵامی نووسراوی ٢١ سەفەر ١٣٢١ ژمارە ٣٥، کرێی ئەم خانەی بە نیازە بۆ پاراستن خانە لە شارۆچکەی خانەقین بکرێت، بە باج دابین دەکرێت، ئەمەش گونجاو نییە، بەڵام لەبەر ئەوەی داهاتی دە یەك (عشر) بە نەقد وەردەگیرێت، کرێی ناوهاتووش بە نەقد وەردەگیرێت، بۆ ئەمەش بە تەلەگرافنامە دەفتەرداری ویلایەتی بەغداد ئاگادار کراوەتەوە، بە پەیوەندی کردن لە وەڵامی نەزارەتی دارایی شکۆدار، نووسراو لە ٢٤ ڕەبیعی کۆتایی ١٣٢١ ژمارە ١١٤٦ بەرز کراوەتەوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.</td></tr>
</table>



| 1 شەوال 1321/ 21 کانوونی یەکەم 1903 | 00586.00028 | A.MKT.MHM |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی دەرەوە
قەڵەمی مەکتوب
ژمارە ٣٣٤٩
جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت
راگەیەندراوی بەندەمانە
وەڵامی نووسراوی ٣٠ رەمەزان ١٣٢١ ژمارە ١٧٧٥ ی سەدری ئەعزەمە، لە کاتی گەیشتنی پیاو ماقوڵانی ئێران بۆ خانەقین ئەو پیاوەی لەگەڵی هاوەڵە بێ ئەوەی مامەڵەی تەندروستی لەگەڵ بکرێت رێگە بە پەرینەوەی دەدرێت، بەمەش فەرمانبەرانی تەندروستی لەلایەن کارگوزاری ئێران بە کەم بینراوە، بریار و فەرمانی سەدارەت بە باڵیۆزخانەی ئێران راگەیەندراوە، نووسراوی نەزارەتی تەندروستی شکۆداریش رەوان کراوە و رەوان بکرێتەوە، بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بەدەستەوەیە.
نازری دەرەوە تۆفیق............



A.}MKT.MHM.00586.00028.003

| 7 شەوال 1321/ 27 کانوونی یەکەم 1903 | 00586.00028 | A.MKT.MHM |
|---|---|---|

بۆ ویلایەتەکانی بەغداد و بەسرا
ئـەم نەخۆشـیەی لـە کەربـەلا سـەریهەڵداوە، ئەلحەمدولیلـلا خەریکـە تـەواو دەبێـت و چەنـد ڕۆژێکـە کـەس تووشـی نەخۆشیەکە نەبووە، بـەڵام تـەرم و گەشـتیارانی ئێـران کـە لـە بـەسرا بـە ڕێگای دەریـا و لـە خانەقیـن بـە ڕێگای ووشـکانی دێنـە کەربـەلا، وەکـو جـاران هاتنـە ژوورەوە و تێپەربوونیـان قەدەغەکـراوە، ئەوانـەی ڕازی نیـن بـە گەڕاندنـەوەی تەرمـەکان بـۆ ئێـران، لـەم شـوێنانە دەنێژرێـن کـە تێـدان، بـەڵام ئـەو گەشـتیارانەی لـە نەجـەف و شـوێنەکانی تـری عیـراق دێـن ڕێگـە پێـدراون و لەسـەر ئاماژەی نەزارەتـی تەندروسـتی ئـاگاداری دراوە و ئـاگاداری دراوەتـە ویلایەتـی بـەسرا.



| 27 جەمادی کۆتایی 1321/ 20 ئەیلوول 1903 | 002173.162941 | BEO |
| --- | --- | --- |

بۆ رسوماتی ئەمانەتی شکۆدار
وێنەکانی نووسراوی راگەیەندراو لە باڵادا تۆمار کراوە، فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری خەلافەتیش دەرچووە، لە رسوماتی ئەمانەتی شکۆدار هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.

لە بارەی نۆژەنکردنەوەی خانەی کارگێری رسوماتی خانەقین.





BEO.002274.170477.002

<table>
<tr><th>BEO</th><th>002274.170477</th><th>7 زیلقەعدە 1321/ 25 کانوونی دووەم 1904</th></tr>
<tr><td colspan="3">
بابی عالی<br>
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ<br>
قەڵەمی مەکتوب<br>
ژمارە ٥٧٧٨<br>
جەنابی عالی پەیوەندیداری سەدارەت<br>
ڕاگەیەندراوی بەندەمانە<br>
وەڵامی نووسراوی ٢٨ کانوونی یەکەم ١٣١٩ ژمارە ٣٢٩٥ ی سەدری ئەعزەمە، بۆ قائیمقامیەتی قەزای خانەقین کە لە پلەی یەکەمە، کەسێك لە هەمان پلە و مولازمی هەڵبژێردراو نەدۆزراوەتەوە، بۆیە محەمەد شەوقی پاشا لە پلەی دووەم نۆرەی هەڵبژاردنی هاتووە و ئاشنای زمانی عەرەبی دامەزرێت، نووسراوی وەرگێردراوی پەسەندکراو پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بە دەستەوەیە.<br>
نازری کاروباری ناوەخۆ
</td></tr>
</table>




BEO.002295.172053.001

<table dir="rtl">
<tr><td>BEO</td><td>002295.172053</td><td>28 زیلحیجە 1321/ 16 مارت 1904</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>بـۆ دامەزراندنـی لـە قائیمقامیەتـی قـەزای خانەقیـن لـە قۆمیسـیۆنی فەرمانبەرانـی مولکیـە نـووسراوی مێـژووی ١٨ زیلحیجـە ١٣٢١ ژمـارە ٦٤٠٥ دەرچـووە، دەرکەوتـووە قائیمقامـی پێشـووی قـەزای صەفـەد حەمـدی ئەفەنـدی لـە قائیمقامیەتـی قـەزای درعـا هەڵبژێـردراوە، هەروەهـا لـەم شـوێنانەی وەکـو قائیمقـام کاری کـردووە لـە هەندێکیـان بەهـۆی بـێ تواناییـەوە لادراوە، بەهـۆی گرنگـی قـەزای خانەقینیـش کـە کەوتۆتـە سـنووری ئێـران، بۆیـە نـووسراو بـۆ نەزارەتەکانـی شـکۆدار کـراوە کەسـێکی گونجـاو و بـە توانـا و تاقیکـراوە هەڵبژێردرێـت، بـە گوێـرەی مەزبەتـەی قۆمیسـیۆنی ناوهاتـوو هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی کارەکـە.</td></tr>
</table>



| 23 زیلقەعدە 1321 /10 شوبات 1904 | 002274.170477 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
لـە قائیمقامیەتـی قـەزای خانەقیـن سـەر بـە ویلایەتـی بەغـداد دامـەزراوە، نـووسراوی مێـژووی ٧ زیلقەعـدە ١٣٢١ ژمـارە ٥٧٧٨ی قۆمیسـیۆنی فەرمانبەرانـی مولکیـە بـۆ سـەروو نێـردراوە و ئامـاژەی پێکـراوە، کـە سـەرەتا شـەوقی پاشـا لـە قائیمقامیەتـی ئورفـا دامـەزراوە، هـەر یـەك لـە وێنەیەکـی دەسـت بـە کار بـوون و دەسـت لـە کار کێشـانەوە و گۆڕینـەوەی ئـەم قائیمقامیانـەی تێـدا بـووە، لـە قۆمیسـیۆن پەسـەند کـراوە، لـە شـورای دەوڵـەت بریـار دراوە لـە یەکێـك لـە قائیمقامیەتـەکان هەڵبژێردرێـت، بـە گوێـرەی پلـە و سـیفەتەوە بـۆ قائیمقامیەتـی خانەقیـن گونجـاوە ئـەم بابەتـە حەواڵـەی نەزارەتـی شـکۆدار کـراوە، بـە مەزبەتـەش لـە قۆمیسـیۆن باسـکراوە، هیممـەت بکرێـت.



BEO.002179.163351.004

| BEO | 002179.163351 | 5 ڕەجەب 1321/ 27 ئەیلوول 1903 |
|---|---|---|
| وێنەی مەزبەتەی مێژووی ٨ حوزەیران ١٣١٩ی ویلایەتی بەغدادە لـە رووی کارگێـری و سیاسییەوە مانـەوەی عەبدوڵـڵا بـەگ قائیمقامـی قـەزای خانەقیـن لـە ئەرکەکەیـدا گونجـاو نییـە، بـۆ ئـەم مەبەسـتە لـە ویلایـەت لێکۆڵینـەوە کـراوە، لـە ئەنجـام ناوبـراو دوور خراوەتـەوە و شـوێنەکەی بـە وەکالـەت بەڕێوەدەبردرێـت، لـە نـووسراوی مێـژووی ٤ ئەیلـوول ١٣٠٦ ژمـارە ٥٦ ی نەزارەتـی شـکۆدار ئاماژەی پێکـراوە، بەهـۆی گرنگـی شـوێنەکەوە کەسـێکی لێهاتـوو و پـر زانیـاری و شـارەزا لـە بارودۆخـی ناوەخـۆ دابنرێـت، بـۆ ئـەم مەبەسـتە فەرمانـی پاشـای جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت جێبەجـێ بکرێـت، لـە میرەکانـی عەشـیرەتی جـاف محەمـەد عەلـی بـەگ گونجـاوە بـۆ کارەکـە، پشـت بەسـتن بـە فەرمانـی پاشـای جەنابـی ملوکانـە پەیوەندیـداری نـەزارەت لەبـارەی محەمـەد عەلـی بـەگ چـی بێـت جێبەجـێ دەکرێـت. | | |



| 8 جەمادی کۆتایی 1321/ 1 ئەیلوول 1903 | 00046.00043 | İ.AS |
|---|---|---|

کۆشکی یڵدزی هومایۆن
فەرمانگەی باش کیتابەت
٤٣٢٦
راگەیەندراوی بەندەمانە
بینباشی عەبدولحەکیم ئەفەندی لە قائیمقامیەتی ئالای ٤ی حللە سەر بە لەشکری شەشەمی هومایۆن بووە و دوورخراوەتەوە، دواتر لە تابووری ٤ی خانەقین سەر بە ئالای ٨٢ی رەدیفی هەمان لەشکر، بە بەرز کردنەوەی پلەکەی دامەزراوە، بە ئاماژە پێکردن و راگەیاندنی سەرعەسکەری والا، جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا فەرموویەتی، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بە دەستەوەیە.
جەنابی سەرکاتیب



İ.AS.00049.00011.004

| İ.AS | 00049.00011 | 8 زیلقەعدە 1321 /26 کانوونی دووەم 1904 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
٢٩٣١
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
ئاغای تابوور ئیسماعیل بەگ لە تابووری عەمارە سەر بە ئالای زەبتیەی ویلایەتی بەسرایە، بە شێوەیەکی کاتی لە ئاغای تابووری مونتەفیك کار دەکات، بەهۆی گرنگی شوێنەکەوە، توانای ناوبراو گونجاو نییە بۆ کارەکە، لە ویلایەتی ناوهاتوو ئاماژەی پێکراوە ناوبراو بگوازرێتەوە بۆ ئالای زەبتیەی بەغداد، بە دامەزراندنی ناوبراو لە ئاغای تابووری خانەقین، لە شوێن ئەویش تابووری ئاغا سادق ئەرکەکە وەربگرێت، کە لە تابووری ئێستر سوارەی سێیەمی ئالای زەبتیەی بەغدادی ناوهاتوو وەکو میوان بوونی هەیە، لەم بارەیەوە مەزبەتە لە فەرمانگەی ژاندارمە رێکخراوە و رەوان کراوە، نووسراوی سەرعەسکەری سەروو راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.

سەدری ئەعزەم




BEO.002373.177901.001

| BEO | 002373.177901 | 6 جەمادی یەکەم 1322/ 19 تەمموز 1904 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
داواکراوە لە میرەکانی جاف محەمەد عەلی بەگ لە قائیمقامیەتی حللە دابمەزرێت، بەڵام بۆ دامەزراندنی لە قائیمقامیەتی خانەقین، نووسراوی مێژووی ١٠ رەبیعی یەکەم ١٣٢٢ ژمارە ١٣٩٣، لەگەڵ بریاری قۆمیسیۆن دەرچووە، دوای مۆڵەت لە ٥ جەمادی یەکەم ١٣٢٢ فەرمانی جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت دەرچووە و هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی کارەکە.




| BEO | 002371.177825 | 4 جەمادی یەکەم 1322/ 17 تەمموز 1904 |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>نووسراوی راگەیەندراو لە بالا تۆمار کراوە، هەروەها فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت دەرچووە، پەراوێزی نووسراو و هاوپێچی ئەوراقی لێکۆڵینەوە رەوان کراوەتەوە، بەم هۆیەوە لە نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار جێبەجێ بکرێت.<br><br>عەبدوڵلا بەگ قائیمقامی خانەقین دراوەتە دادگا. | | |




A.}MKT.MHM.00588.00012.001

| 27 زیلحیجە 1322/ 4 مارت 1905 | 00588.00012 | A.MKT.MHM |
|---|---|---|
| بۆ پاراستن خانەی خانەقین، ئامێری فرنی تاقیگە لە پاریس هاتووە، بۆ ئەمەش لە کارگێری رسوماتی بەغداد داوای رەسمی گومرگ کراوە، لەبەر ئەوەی ئەم ئامێرە بۆ تەندروستی گشتی بە سوودە، پێویستە ئەم جۆرە ئامێرانە لە رسومات ببووردرێن و ئەم جۆرە شتانەی کە لە ئەوروپاوە دەکڕدرێت، بە گەیشتنی بۆ کەناراوەکانی دەوڵەتی عوسمانی رسومات وەرنەگیرێت، بۆ ئەم مەبەستەش نووسراوی نەزارەتی تەندروستی شکۆدار لە ٢٥ زیلحیجە ١٣٢٠ ژمارە ١٧٩ بەرز کراوەتەوە، هاوپێچ رەوان بکرێتەوە و هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی. | | |



| 17 سەفەر 1322/ 3 مایس 1904 | 002326.174410 | BEO |
|---|---|---|
| نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>وەڵامی نووسراوی ١٠ سەفەر ١٣٢٢ ژمارە ٨٦٩ ی دەوڵەتە، چ هۆکارێکی سیاسی بۆتە هۆی بریاری هێشتنەوەی محەمەد عەلی بەگ لە خانەقین، بە پرس و راییکردنی لە وەکالەتی ویلایەتی بەغدادی شکۆدار، هیممەت بکرێت لە راگەیاندنی. | | |



| 22 جەمادی کۆتایی 1322/ 3 ئەیلوول 1904 | 002405.180374 | BEO |
|---|---|---|

بۆ لایەنی والای سەر عەسکەر
فەرمانبەرانی رسوماتی ئێران لە ناوچەی خۆشگەرد لە سەر سنووری قەزای خانەقین قەڵایەکیان دروست کردووە، کە نزیکەی ٣٠ پیادە و ١٥ سوارە لەخۆدەگرێت، نووسراو لە وەکالەتی ویلایەتی بەغدادی شکۆدار بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار نێردراوە لەگەڵ نووسراوی مێژووی ١٩ جەمادی کۆتایی ١٣٢٢ ژمارە ٢٩٠١ بە هاوپێچ بۆ سپاهیدار بەرز کراوەتەوە.




BEO.002331.174817.001

<table dir="rtl">
<tr><td>BEO</td><td>002331.174817</td><td>24 سەفەر 1322/ 10 مایس 1904</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ لایەنی بەرزی نەزارەتی دادی شکۆدار<br>کارگوزاری موقاتەعەی عالیا لە قەزای خانەقین، عەباس هان و براکەی محەمەد بەگ لەگەڵ هاوەڵانی لە داوای بابەتی کوشتن گومانیان لێ دەکرێت، بۆ ئەم مەبەستە تەلەگرافنامە لە وەکالەتی ویلایەتی بەغداد بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار نێردراوە، لەگەڵ وێنەی نەزارەتی ناوهاتوو لە مێژووی ٢٢ سەفەر ١٣٢٢ ژمارە ١٠٩٠ بۆ سەروو بەرز کراوەتەوە، هاوپێچ ڕەوان بکرێتەوە.</td></tr>
</table>



BEO.002341.175549.001

| 10 رەبیعی یەکەم 1322/ 25 مایس 1904 | 002341.175549 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
کارگوزاری موقاتەعەی میری عولیا لە قەزای خانەقین عەباس هان و براکەی محەمەد بەگ لەگەڵ هاوەڵانی گومانیان لەسەرە، بۆیە بە گوێرەی یاسای عەشیرەت مۆڵەت بدرێت دوور بخرێنەوە، بۆ ئەمەش لە سەر نووسراوی مێژووی ٢٢ سەفەر ١٣٢٢ ژمارە ١٠٩٠، لە وەکالەتی ویلایەتی بەغداد پەیوەندی بە نەزارەتی دادی شکۆدار کراوە، بە تێروانین لە بارودۆخی ناوەخۆ ئەندامانی عەشیرەتی نیشتەجێ بوو، دژی عەباس و هاوەڵانی سکاڵایان بەرز کردۆتەوە و تۆمەتبار کراون بە بابەتی کوشتن، بۆیە دەبێ عەشیرەتە کۆچەرییەکان لە مەدەنیەت نزیك بکرێنەوە، بە کشتوکاڵ خەریك بکرێن، لە بارەی ناوبراوەوەش لە دەرەوەی یاسا مامەڵەیان لەگەڵ نەکرێت، ئەم دەستپێشخەریەش کاریگەری خراپی دەبێت، بە تێروانین لەم بابەتەدت هیممەت بکرێت لە چارەسەرکردنی.


İ.DH. 01424

| İ.DH | 01424.000026 | 14 ڕەبیعی کۆتایی 1322/ 28 حوزەیران 1904 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
١٠٥٤
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
پێشنیار کراوە یەکێك لە میرەکانی جاف بە ناوی محەمەد عەلی بەگ لە قائیمقامیەتی حللەی سەر بە ویلایەتی بەغداد دابمەزرێت، بەڵام لە ویلایەتی ناوهاتوو بەباش زانراوە، ناوبراو لە قائیمقامیەتی خانەقین دابمەزرێت، بۆ ئەم مەبەستەش نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار و مەزبەتەی ڕێکخراوی قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە بەیەکەوە ڕاگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەبارەی دامەزراندنی ناوبراو لە قائیمقامیەتی خانەقین جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە ڕاگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.



| 11 رەبیعی کۆتایی 1322/ 25 حوزەیران 1904 | 01424.000024 | İ.DH |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
١٠١٥
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
عەبدوڵڵا بەگ قائیمقامی قەزای خانەقین سەر بە ویلایەتی بەغداد، هەندێك کەسی هان داوە بۆ تاڵان و هێرش کردن، هەروەها هەستاوە بە وەرگرتنی بەرتیل و دە یەکی بە کەموکوری حەواڵە کردووە، تۆماری لێکۆڵینەوەی ئەم جۆرە کردەوانەی ناوبراو راگەیەندراوە، بە مەبەستی دادگاییکردنی، ئاگاداری لە ویلایەتی ناوهاتوو حەواڵەی نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار کراوە، مەزبەتەش لە فەرمانگەی مولکیەی شورای دەوڵەت دراوەتە قەڵەم، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.



| 28 زیلقەعدە 1323/ 24 کانوونی دووەم 1906 | 002752.206345 | BEO |
|---|---|---|

بـە تێروانیـن لـە نـووسراوی شـورای دەوڵەتـی شـکۆدار، هەروەهـا پشـت بەسـتن بـەم بابەتانـە هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی مامەڵـە و ئـاگاداری نەزارەتـی ناوەخـۆی شـکۆدار.
قائیمقامـی پێشـووی قـەزای خانەقیـن عەبدوڵـڵا بـەگ و قائیمقامـی پێشـووی قـەزای خۆراسـان محەمـەد ئەفەنـدی دادگایـی نەکرێـن.


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
BEO
2696 202128

BEO.002696.202128.001

| BEO | 002696.202128 | 28 شەعبان 1323/ 28 تشرینی یەکەم 1905 |
|---|---|---|

بەهۆی سەرپێچی و خراپەکاری محەمەد عەلی بەگی جاف قائیمقامی خانەقین، بە واژووی عوسمان پاشازادە مستەفا لەگەڵ واژووی خانەوادەکانی بەغداد عەبدولمەجید و ١٤ لە هاوەڵانی دوو پارچە تەلەگرافنامە لە خانەقین رەوان کراوە و بۆ سەرەوە بەرز کراوەتەوە، بە تێروانین و سەرنج دان لە بابەتەکە بە پەلە و خێرا بابەتەکە چارەسەر بکرێت.



| 8 شەعبان 1320/ 10 تشرینی دووەم 1902 | 002678.200792 | BEO |
|---|---|---|

بۆ ویلایەتی بەغداد
لە خانەقین رسوماتی ئەهلیەی ئاژەڵ (Heyvanat-ı ehliye rüsumatı) لە ئاژەڵی بازرگان و گەشتیارانی ئێرانی وەرگیراوە، بۆ ئەمەش لە باڵیۆزخانەی ئێران بەردەوام سکاڵا بەرز کراوەتەوە و لە ٢٩ ئەیلوول ١٣١٩ تەلەگراف بۆ پایەی ویلایەت رەوان کراوە.






BEO.002647.198472.001

| BEO | 002647.198472 | 19 جەمادی کۆتایی 1323/ 21 ئاب 1905 |
|---|---|---|

هـۆکاری ئـەم بارودۆخـە نەخـوازراوەی لـە خانەقیـن روویـداوە، دەگەڕێتـەوە بـۆ محەمـەد عەلـی ئەفەنـدی قائیمقامـی قـەزا و ئەحمـەد خـان کار پـەروازی ئێـران، تـا ئەوانـەش لەسـەر ئـەم ئەرکانـە بـن، ئـەوا ئـەم چاکسـازیانەی بـەم دواییـە لـە نـاو خانەکانـی کەرەنتینـەی عیراقـی عەرەبـی کـراوە، هیـچ ئەنجامێکـی نابێـت، خانەقیـن کـە دەرگای ئێرانـە، پزیشـکی تەندروسـتی سـنووردار کـراوە، ئـەم زانیارییانـە لەلایـەن بەرپرسـی کەرەنتینـەی بەغـداد قاسـم عزەددیـن ئەفەنـدی ئامـاژەی پێکـراوە و بەرزکراوەتـەوە، دەبـێ محەمـەد عەلـی بـەگ گۆڕینـەوەی پـێ بکرێـت، نـووسراوی نەزارەتـی تەندروسـتی لـە مێـژووی ١٧ جەمـادی کۆتایـی ١٣٢٣ ژمـارە ٧٩ بـۆ سـەروو بەرزکراوەتـەوە، بـە پەلـە کارەکـە جێبەجـێ بکرێـت و هاوپێـچ رەوان بکرێتـەوە.



BEO.002595.194601.001

| 6 رەبیعی کۆتایی 1323/ 10 حوزەیران 1905 | 002595.194601 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار
وەڵامی نووسراوی مێژووی ٢٩ شەعبان ١٣٢١ ژمارە ٣١٥٩ی ئەنجوومەنی تایبەتی بریکارەکانە، نابێت ئێرانیەکان لە خانەقین و هەندێك ناوچەی تر ببنە خاوەنی مولك، بۆ ئەم مەبەستەش کەی ئەم بریارە دراوە و پشت بەستن بە چ فەرمانێك بوونەتە خاوەنی مولك و لە چ مێژوویيەك ئێرانیەکان واژوویان کردووە، لێکۆڵینەوە بکرێت و ئەنجامەکەی بەرز بکرێتەوە.

BEO.002555.191578.002

| BEO | 002555.191578 | 12 سەفەر 1323/ 18 نیسان 1905 |
|---|---|---|
| بۆ سەرۆکایەتی جەنابی سەدری ئەعزەم<br>ڕۆژی ١٢ی نیسان تەرمی دایکی شای ئێران دەبردرێتە خانەقین، وەکو ڕێز بۆ پێشوازی کردن لە تەرمەکە، پێویستە ئامادەکاری بکرێت، جگە لە ڕێکخستنی سەربازی نیزامیە لە ناو ویلایەت قوماندانی ژاندارمە ڕاگەیەندراوە فەرمان.<br>عەبدولوەهاب والی بەغداد | | |



İ.AS.00059.00007.004

| İ.AS | 00059.00007 | 12 شەعبان 1323/ 12 تشرینی یەکەم 1905 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
٢٢٥٧
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
تابووری دووەمی خۆراسان سەر بە ئاڵای ژاندارمەی ویلایەتی بەغداد لە خانەقین جێگیرە، بلۆکی یەکەمی سوارە بۆ قەزای سامەرا و بلۆکی حەوتەمی سوارە بۆ قەزای بەدرە، هەروەها بلۆکی چوارەمی سوارە بۆ ناحیەی قزلربات، تابووری سنووری خانەقین و بلۆکی چوارەمی سوارەی قەزای خانەقینیش گۆرینەوەیان پێ بکرێت، بۆ ئەمەش مەزبەتە لە فەرمانگەی ژاندارمە ڕێکخراوە و ڕەوان کراوە، نووسراوی سەرعەسکەری سەروو ڕاگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە ڕاگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.



| 5 موحەررەم 1324/ 1 مارت 1906 | 002770.207725 | BEO |
|---|---|---|

بۆ لایەنی والآی سەرعەسکەر
بـۆ پاراسـتنی سـنوور بـە درێژایـی موحەممـەرە تـا خانەقیـن، لەلایـەن قوماندانیەتـی لەشـکری شەشـەمی هومایـۆن سـەرۆکی عشـیرەتی بەنـی لام چەتـە غەسـبان دامـەزراوە، بـە دووبـارە ئـاگادار کردنـەوەی، بـە مـۆری قوماندانـی لەشـکری ناوهاتـوو سـلێمان پاشـا و سـەرۆکی ئەرکانـی جەنگـی فەخـری پاشـا دوو پارچـە نـووسراو بەدەسـت گەیشـتووە، ئەمجـارە لـە مێـژووی ٢٥ شـوبات ١٣٢١ لـە قومانـدان و والـی بـەسرا تەلەگـراف بـە هاوپێچـەوە بـۆ والآی سـەر عەسـکەر رەوان کـراوە، سـەرەتا بـە نـووسراو و دوێنێـش بـە زار ئامـاژەی پێکـراوە، دامەزراندنـی چەتەیەکـی وەکـو ناوبـراو بـۆ پاراسـتنی سـنوور بـە هیـچ شـێوەیەك گونجـاو نییـە، بۆیـە زانیـاری بدرێتـە قوماندانیـەت، هاوپێچـەکان بڵاوبکرێنـەوە.



| BEO | 002879.215852 | 2 جەمادی کۆتایی 1324/ 24 تەمموز 1906 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
وێنەکانی نووسراوی راگەیەندراو لە بالا تۆمار کراوە و بە گوێرەی پەراوێزی فەرمانی پاشای پەیوەندیداری خەلافەت و گەرانەوەی ئەوراقی لێکۆڵینەوە، لە نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.

لە مامەڵەی کەرەنتینە محەمەد عەلی بەگ قائیمقامی قەزای خانەقین سەرپێچی و کاری نایاسایی کردووە، بۆیە بدرێتە دادگا.



BEO.002841.213063.001

<table>
<tr><th>BEO</th><th>002841.213063</th><th>7 ره‌بیعی كۆتایی 1324/ 31 مایس 1906</th></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شكۆدار<br>شەوكەت پاشا قائیمقامی قەزای خۆراسان سەر بە ویلایەتی بەغداد لە قائیمقامیەتی نەجەف و عەبدوڵلا رەمزی ئەفەندی قائیمقامی نەجەفیش لە قائیمقامیەتی خۆراسان، هەروەها محەمەد عەلی بەگ قائیمقامی خانەقین لە قائیمقامیەتی حللە و ساڵح پاشا قائیمقامی حللە لە قائیمقامیەتی خانەقین بگوازرێنەوە و دابمەزرێنن، جگە لەمە بە دەستگیر كردنی تاڵب ئەفەندی قائیمقامی قەزای جەزیرە بە گوێرەی ئەنجامی لێكۆڵینەوەكان كارەكە جێبەجێ دەكرێت، دوای دوورخستنەوەی ناوبراو، لە شوێن ئەو سالم ئەفەندی قائیمقامی قەزای كازمیە دابمەزرێت، لەسەر نووسراوی ٩ نیسان ١٣٢٢ ژمارە ٦٢٢ بە بریاری قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولكیەش جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشای ١٧ مایس ١٣٢٢ رەزامەندی نیشان داوە، هیممەت بكرێت لە جێبەجێ كردنی.</td></tr>
</table>



BEO.002812.210847.002

| 27 سەفەر 1324/ 22 نیسان 1906 | 002812.210847 | BEO |
|---|---|---|
| فەرمانگەی ئەرکانی جەنگی گشتی<br>هۆبەی ٤<br>٣٢٢<br>راگەیەندراوی بەندەمانە<br>چەند رۆژێك لەمەوبەر ئێرانیەکان لە دەورووبەری خانەقین بە شێوەیەکی سەرنجراکێش زەخیرە و ئەرزاق و خورما دەکڕن و بۆ لای ئێران دەبەن، ئەم کارەش لە خانەقین بە میری لیوای سوارە رەشید پاشا رابگەیەندرێت، تەلەگرافنامە لە قوماندانیەتی لەشکری شەشەمی همایۆن هاتووە و لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بە دەستەوەیە. | | |



BEO.002901.217509.001

| 11 رەجەب 1324/ 31 ئاب 1906 | 002901.217509 | BEO |
|---|---|---|

نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار
قاسم ئاغا کوڕی شێرخان سەرداری ئێران لەگەڵ ١٢ سوارە سنووری بەزاندووە، نیو کاتژمێر دوور لە قەزای خانەقین هێرشی کردۆتە سەر گوندی ئەمین باییر، لە ئەنجام ٢ کەسی کوشتووە و یەکێکیشی بریندار کردووە، لەگەڵ ئەمەش مەڕومالات و ئاژەڵی تالان کردووە و هەڵاتووە، نووسراوی ٩ رەجەب ١٣٢٤ ژمارە ١٧٢٦ی سەر عەسکەر هاوپێچ بۆ سەروو بەرز کراوەتەوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردن و گەراندنەوەی هاوپێچەکەی.



| 5 زیلحیجە 1324/ 20 کانوونی دووەم 1907 | 002982.223636 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار
چەند گەشتیارێکی رووسی بە پیادە بەرەو بەغداد هاتوون، چەند کاتژمێرێك پێش گەیشتن بە شارەکە دووچاری سەرپێچی بوونەتەوە، هەر دوای راگەیەندراوی رووسیا، لە ماوەی ٥-٦ کاتژمێر تاوانباران دەستگیر کراون و بەپێی یاسا مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت، هەروەها هەروەك دەزانرێت مۆسیۆ ماشقۆف زمانێکی زبر و توندی هەیە، لە جیاتی ئەوەی مەمنونی فەرمانبەرانی زەبتیە و داد بێت و سوپاسیان بکات، کە بەم خێراییە تاوانباران دەستگیر کراون، بەڵام پێچەوانەی راستییەکان قسەی کردووە، بەهۆی وەرگرتنی ئەم هەواڵە ئەگەر چالاکی نابەجێ ئەنجام بدات دەستگیر کردنی دروستە، تەلەگرافنامەی ویلایەتی بەغداد لە ٣ کانوونی دووەم ١٣٢٢ هاوپێچ بۆ سەروو بەرز کراوەتەوە، بە تێروانین لە بەراییەکان بە شێوەیەکی گونجاو ئاگاداری بدرێتە باڵیۆزخانە و رابگەیەندرێت.


BEO.002987.224008.001

| BEO | 002987.224008 | 16 زیلحیجه 1324/ 31 کانوونی دووەم 1907 |
|---|---|---|

نووسراو بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار

هاوپێچی نووسراوی مێژووی ٢٥ زیلقەعدە ١٣٢٤، حکوومەتی ئێران بە ناوی پاراستنی سنوور، کورەکەی شێر خان و پیاوەکانی لە سنووری خانەقین جێگیر کردووە، بەڵام ئەمانە بە هێرش و تاڵان خەریکن، نووسراو لە قائیمقامیەتی خانەقین هاتووە و رووداوەکە باسکراوە، ئەگەر ئەم بابەتە بەردەوام بێت، ئەوا رووداوەکە دەچێتە قالبێکی سیاسییەوە، بۆیە ناوبراو لەوێ دوور بخرێتەوە و لە وەکالەتی ویلایەتی بەغداد نووسراوی ١٦ زیلقەعدە ١٣٢٤ ژمارە ٢٤ و تەلەگرافنامەی مێژووی ١٦ کانوونی دووەم ١٣٢٢ بەیەکەوە بەرز کراوەتەوە، بە تێروانین لە بابەتەکە و ئاماژەی پێشوو جێبەجێ بکرێت و رابگەیەندرێت دواتر هاوپێچەکان رەوان بکرێتەوە.


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
BEO
2915 218607

BEO.002915.218607.001

| BEO | 002915.218607 | 5 شەعبان 1324/ 24 ئەیلوول 1906 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار
هاوپێچی نووسراوی مێژووی ٢٨ رەجەب ١٣٢٤، لەلایەن حکوومەتی ئێران بە ناوی پاراستنی سنوور لە دەورووبەری قەزای خانەقین لەسەر سنوور شێرخان و هاوەڵانی جێگیرکراون، بەڵام جموجۆڵی نەگونجاویان ئەنجام داوە، لە قائیمقامیەتی قەزای ناوهاتوو نووسراو هاتووە و بەباش زانراوە هەرچی زووە ناوبراو لە ناوچەکە دوور بخرێتەوە، بۆ ئەمەش ئەمجارە لە ویلایەتی بەغداد نووسراوی مێژووی ٧ رەجەب ١٣٢٤ ژمارە ٩ بۆ سەروو بەرز کراوەتەوە، بە تێروانین لە بابەتەکە و ئاماژەکانی پێشوو بە پەلە چارەسەری بابەتەکە بکرێت و هیممەت بکرێت لە ناردنەوەی هاوپێچەکان.



| 4 رەجەب 1324/ 24 ئاب 1906 | 002897.217252 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار
حکوومەتی ئێران بە ناوی پاراستنی سنوور، لەسەر سنووری خانەقین، شێرخان و هاوەڵانی داناوە، بەڵام ئەمانە تاقمێك سەرپێچی و کاری نەگونجاویان ئەنجام داوە، بۆیە زیاتر مانەوەی ئەمانە لە ناوچەکە کێشەی زیاتر بەدوای خۆیدا دەهێنێت، تا ئێستا عەشیرەتەکانی لای ئێمە ئارامیان گرتووە و خۆراگر بوون بەڵام ئاوا بڕوات ناچار دەبن رووبەڕوویان ببنەوە، دەبێ هەرچی زووە ناوبراوان لەوێ دووربخرێنەوە و لە ویلایەتی بەغداد تەلەگرافنامەی مێژووی ٩ ئاب ١٣٢٢ بۆ سەروو بەرز کراوەتەوە، لەبارەی سەرپێچی شێرخان ئاماژەی ناوەخۆ دراوەتە نەزارەتی شکۆدار، ئەمڕۆ ئاگاداری دراوەتە باڵیۆزخانەی ئێران، ئەنجامەکەی رابگەیەندرێت و هیممەت بکرێت لە ناردنەوەی هاوپێچیەکان.



| 16 شەعبان 1322/ 26 تشرینی یەکەم 1904 | 002772.207888 | BEO |
|---|---|---|

بۆ لایەنی والای سەر عەسکەر
هاوپێچی نووسراوی مێژووی ٧ موحەررەم ١٣٢٤، سەرۆکی عەشیرەتی بەنی لام بە چەتە و توندرەو ناسراوە، کەچی بۆ پاراستنی سنووری ئێران، لە موحەممەرە تا خانەقین جێگیر کراون، ئەم زانیارییانە بە عەشیرەتەکان راگەیەندراوە، بۆیە چۆنیەتی جولە و پرسی ئەم بابەتە بۆ سلێمان پاشا قوماندانی لەشکری شەشەمی همایۆن و فەخری پاشا سەرۆکی ئەرکانی جەنگی و فازڵ پاشا قوماندانی سوارە نووسراوەتەوە و نووسراوەکانیش پارێزراون، لەسەر هەندێك ووتە ٣ تەلەگرافنامە لە ویلایەتی بەسرا بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار نێردراوە، لەگەڵ نووسراوی مێژووی ٥ موحەررەم ١٣٢٤ ژمارە ٥٠١٥ نەزارەتی ناوهاتوو بەیەکەوە بۆ لایەنی سەر عەسکەر نێردراوە، بە تێروانین لە ئاگاداری پێشوو بەپەلە کارەکە جێبەجێ بکرێت و رابگەیەندرێت و هاوپێچەکان رەوان بکرێنەوە.



| 18 ڕەبیعی کۆتایی 1324/ 11 حوزەیران 1906 | 01447.000013 | İ.DH |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
١٢٩٢
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
لەسەر نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار کە حەواڵەی شورای دەوڵەت کراوە، مەزبەتەش لە فەرمانگەی مولکیە دراوەتە قەڵەم و هاوپێچ ڕاگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لە ناو ویلایەتی بەغداد محەمەد عەلی بەگ قائیمقامی قەزای خانەقین مامەڵەی کەرەتینەی بە خراپی بەکارهێناوە، دوای ئەوەی خراپەکارییەکانی روون بۆتەوە، بۆ دادگایی کردنی بە پێویست زانراوە ئاگاداری ویلایەت حەواڵەی نەزارەتی ناوهاتوو بکرێت، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە ڕاگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.
سەدری ئەعزەم



| 18 جەمادی کۆتایی 1325/ 29 تەمموز 1907 | 003111.233297 | BEO |
| --- | --- | --- |

بۆ ویلایەتی بەغداد شیفرە

ئـەو کارگوزارانـەی کەلوپەلـی بازرگانـی ئینگلیزیـان گواسـتۆتەوە بـۆ خانەقیـن، لـە کاتـی گەیشـتنیان بـۆ خانەقیـن، بازرگانەکانـی ئینگلیـز چوونەتـە ئـەوێ دژی بریـارەکان وەسـتاونەتەوە، بـەم شـێوەیە گواسـتنەوەی کەلوپەلـی بازرگانـی و بازرگانـان سرکـراون، ئـەم زانیارییانـە لـە باڵیۆزخانـە راگەیەنـدراوە، بەپەلـە لێکۆڵینـەوە لـەم بابەتـەدا بکرێـت، رێگـە نەدرێـت کارێکـی لـەم جـۆرە دووبـارە بێتـەوە و مەیـدان خـۆش نـەکات بـۆ بـەرز کردنـەوەی سـکاڵا و گلەیـی کـردن.



BEO.003086.231420.001

| BEO | 003086.231420 | 13 جەمادی یەکەم 1325/ 24 حوزەیران 1907 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
وێنەی نووسراوی راگەیەندراو لە بالادا تۆمار کراوە، فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت دەرچووە و بە گوێرەی پەراوێز و هاوپێچەکەی لە نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.

لە بارەی خەرجی نۆژەنکردنەوەی تەلەگرافخانەی خانەقین.



| 16 جەمادی یەکەم 1325/ 27 حوزەیران 1907 | 003087.231513 | **BEO** |
|---|---|---|

شیفرە بۆ ویلایەتی موسڵ
ئـەم ماوەیـە عەشـیرەتەکانی هەمەوەنـد و داودە لـە نێـوان خانەقیـن و ئالیجـە هێـرش دەکەنـە سـەر دانیشـتوانی عەشـیرەتی جاف، ئـەم هێـرش و تاڵانەشـیان بـە مەبەسـتە، بۆیـە ئـەم ناوچەیـە بـە تەواوەتـی ئەمنیەتـی تێـك چـووە، هەروەهـا لـە سـەر رێـگای خانەقیـن و ئالیجـە ئەندامانـی ژاندارمـە و نیزامیـەی منارەکانـی سـنوور تێکەڵـی کارەکـە بوونـە و ئاشـکرایە لـە جیاتـی ئـەوەی چاودێـری ئێـران بکـەن، ناچـارن خەریکـی قەدەغەکردنـی کاری چەتەیـی بـن، بـۆ ئامـادەکاری و چارەسـەر بابەتەکـە نابـێ رێگـە بدرێـت سـەرباز بـەم کارانـە خەریـك بـن، بـە لایەنـی سـەر عەسـکەر راگەیەنـدراوە، بەپەلـە چارەسـەری بابەتەکـە بکرێـت.



BEO.003087.231513.002

| 14 جەمادی یەکەم 1325/ 25 حوزەیران 1907 | 003087.231513 | **BEO** |
|---|---|---|

فەرمانگەی ئەرکانی جەنگی گشتی
هۆبەی سێیەم
١٠٤٧
راگەیەندراوی بەندەمانە
بە فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت، جەنابی فەریق پرنۆ پاشا سەرۆکی ئەرکانی جەنگی لەشکری شەشەمی هومایۆن چاودێری و پشکنینی فەرمانگەی لەشکری هومایۆنی وەرگرتووە، لە گوڵعەنبەر تەلەگرافنامەیەکی ناردووە، لە دەستەواژەیەکی ئاماژەی پێکراوە ئەم ماوەیە عەشیرەتەکانی هەمەوەند و داودە لە نێوان خانەقین و ئالیجە بە مەبەست هێرش دەکەنە سەر دانیشتوانی عەشیرەتی جاف، تالان و سەرپێچی ئەنجام دەدەن، بەمەش بە تەواوەتی ئەمنیەتی ناوچەکە تێك چووە، لەسەر رێگای خانەقین و ئالیجەش ئەندامانی ژاندارمە و نیزانیەی منارەکانی سنوور لە جیاتی ئەوەی خەریکی چاودێری ئێران بکەن، بە ناچاری سەرقاڵی قەدەغەکردنی ئەم هێرشانە دەکەن، بۆیە رێگە نەدرێت سەربازی شاهانە بەم کارانە خەریك بێت، فەرمانی پەیوەندیداری سەدارەتە کە ئاگاداری بدرێتە ویلایەت، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بە دەستەوەیە.
رزا سەرعەسکەر



| 4 زیلحیجە 1325/ 8 کانوونی دووەم 1908 | 003228.242047 | BEO |
|---|---|---|

بۆ لایەنی والای سەر عەسکەر
وێنەی نووسراوی راگەیەندراو لە باڵا تۆمار کراوە و بە گوێرەی پەراوێزی فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت لە والای سەر عەسکەر هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.

لە بارەی گۆرینەوەی ئەرکی وەلی عەباس ژاندارمەی ئالای بەغداد لەگەڵ بلۆکەکانی مەندەلی و خانەقین.



| 9 شەعبان 1325/ 17 ئەیلوول 1907 | 003147.235994 | BEO |
|---|---|---|

بۆ ویلایەتی بەغداد شیفرە
نیعمەتوڵڵا خان حاکمی سەرپیل بیرۆکەی هێرش کردنە سەر لایەنی خانەقینی هەیە، دوای هاتنی ئەم هەواڵە، بە فەرمانی پاشا قوماندانیەتی لەشکری شەشەمی هومایۆن، تابوورێك رەوانی ناوچەکە بکرێت، بە سەر عەسکەریش راگەیەندراوە، لەلایەنی مولکیەش رێگە بە سەرپێچی ئێرانیەکان نەدرێت.



| 19 رەجەب 1325/ 28 ئاب 1907 | 003135.235053 | BEO |
|---|---|---|

بۆ رسوماتی ئەمانەتی شکۆدار
وێنـەی نـووسراوی راگەیەنـدراو لـە بـاڵادا تۆمـار کـراوە و فەرمانـی پاشـای جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت هاتـووە و بـە گوێـرەی پەراوێزەکـەی لـە رسـوماتی ئەمانەتـی شـکۆدار هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی.

لەبارەی خەرجی نۆژەنکردنەوەی فەرمانگەی رسوماتی خانەقین.




صدارت عظمى مكتوبى قلمى



2 vrk.
(1 shf boş)

BEO.003223.241686.001

| BEO | 003223.241686 | 30 زیلقەعدە 1325/ 4 کانوونی دووەم 1908 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار

هاوپێچ نووسراوی مێژووی ٢٩ زیلقەعدە ١٣٢٥ ژمارە ٢٨٢٣، ماوەیەکی زۆرە قائیمقامیەتەکانی خانەقین و عنە و شامیەی سەر بە ویلایەتی بەغداد بە وەکالەت بەڕێوەدەبردرێت، بۆ قائیمقامیەتەکانی ناوهاتوو لە مێژووی ١٠ تشرینی یەکەم ١٣٢٣ شیبلی ئەفەندی دامەزراوە، بەڵام تا ئێستا نەچۆتە سەر ئەرکەکەی، ئەمجارە لە ویلایەتی ناوهاتوو تەلەگرافنامە لە مێژووی ١٩ کانوونی یەکەم ١٣٢٣ هاوپێچ بۆ سەروو ناردراوە، بە تێروانین لە بەراییەکان و ئاگادارکردنەوەکان بەپەلە کارەکە جێبەجێ بکرێت و هاوپێچەکان ڕەوان بکرێتەوە.





BEO.003232.242400.002

<table dir="rtl">
<tr><th>BEO</th><th>003232.242400</th><th>17 زیلحیجە 1325/ 21 کانوونی دووەم 1908</th></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی دەرەوە<br>قەڵەمی مەکتوب<br>ژمارە ٢٧٧٩<br>جەنابی پاشای جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت<br>راگەیەندراوی بەندەمانە<br>لەلایەنـی خانەقیـن سـەربازی شـاهانە سـنووری بەزانـدووە و بـە مەبەسـتی بەرگـری کـردن فەرمـان دراوەتـە عەشـیرەتەکانی ناوچەکـە، ئـەم بابەتـە لەلایـەن رۆژنامـەوە بڵاوکراوەتـەوە، لـە باڵیـۆزی ئێـران تەلەگرافنامـە لـە مێـژووی ٢١ کانوونـی دووەم ١٩٠٨ هاوپێـچ هاتـووە و پێشـکەش کـراوە، بریـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەم کەسـەیە کـە فەرمانـی بـە دەسـتەوەیە.<br>نازری دەرەوە ..................</td></tr>
</table>



| 23 زیلحیجە 1325/ 27 کانوونی دووەم 1908 | 003237.242767 | BEO |
|---|---|---|

فەرمانگەی ئەرکانی جەنگی گشتی
هۆبەی چوارەم
٣٩٣٥
ڕاگەیەندراوی بەندەمانە
بە فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت، تابووری ١٢ ی نیشانچی لە کەرکووك بۆ سەلاحیە، لەوێشەوە بۆ خانەقین دەگوازرێتەوە، خەرجیەکەشی لە ناوەخۆ دابین نەکراوە، بۆیە جولەکردنیان دواکەوتووە، بۆ ئەوەی تابووری ناوهاتوو بەپەلە جولە بکات و بگاتە شوێنی مەبەست و ئامادەکاری بکرێت، نووسراو بۆ ویلایەتی موسڵ کراوە، هەروەها تەلەگرافنامە لە قوماندانیەتی لەشکری شەشەمی هومایۆن هاتووە و نووسراوی پێ کراوە، لەم بابەتەدا ئاماژە بۆ بەرپرسانی بابەتەکە ڕەوان بکرێت و لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بە دەستەوەیە.
ڕزا سەر عەسکەر




BEO.003167.237476.002

| 5 رەمەزان 1325/ 12 تشرینی یەکەم 1907 | 003167.237476 | BEO |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی مەکتوب
ژمارە ٣٠٥٢
بۆ جەنابی پایەبەرزی جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت
راگەیەندراوی بەندەمانە
بۆ ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە، تاهیر بەگ مەکتوبی پێشووی ویلایەت رەوانی خانەقین کراوە، بە شێوەیەکی براوە ٢٥٠٠ قوروش خەرجی رێگای بۆ دابین بکرێت، بۆ وەرگرتنی رەزامەندیش تەلەگرافنامە بۆ ویلایەتی بەغداد کراوە، هەروەها ئەم فەرمانبەرانەی بۆ لێکۆڵینەوە رەوان دەکرێن خەرجی رێگاکەیان تەواو نییە، پێویستە خەرجی رێگای زیاتر خەرج بکرێت، بە بریاری شورای دەوڵەت و بە ووتەی ژمێریاریش رەزامەندی وەربگیرێت، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە بریاری بە دەستەوەیە.

نازری کاروباری ناوەخۆ




BEO.003147.235994.003

<table>
<tr><td>BEO</td><td>003147.235994</td><td>9 شه‌عبان 1325/ 17 ئه‌يلوول 1907</td></tr>
<tr><td colspan="3">فەرمانگەی گشتی ئەرکانی جەنگی<br>هۆبەی ٤<br>لە مێژووی ٢٧ ئاب ١٣٢٣ تەلەگرافنامەی جەنابی فەریق سدقی پاشا قوماندانی لەشکری شەشەمی هومایۆن هاتووە<br>بە گوێرەی ئەم هەواڵەی هاتووە، ئێران بە قوماندانیەتی حاکیمی سەرپیل نیعمەتوڵڵا خان ٣٠٠ سەرباز و ١٠٠٠ سوارە لە پیاوانی عەشیرەتی کۆکردۆتەوە، بیرۆکەی هێرش کردنە سەر خانەقینی هەیە، بە ئاماژەی قائیمقامی سەلاحیە بە ویلایەتی موسڵ رادەگەیەندرێت، لەم بابەتەدا لێکۆڵینەوەی پێویست ئەنجام بدرێت و لە هەموو کاتێك زیاتر چاودێری بکرێن و رێگە نەدرێت سەرپێچی ئەنجام بدرێت، لە ناوەخۆ ئاگاداری و رێنمایی پێویست و توند دەرچووە، تەلەگرافنامەی بەندەمان لە مێژووی ١٣ ئاب ١٣٢٣ راگەیەندراوە، کە تابوورێك رەوانی خانەقین بکرێت.</td></tr>
</table>




İ.AS.00069.00018.004

| İ.AS | 00069.00018 | 7 زیلقەعدە 1325 /12 کانوونی یەکەم 1907 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
٣٥١٨
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
تابـووری دووەمـی ئـاڵای ژاندارمـەی ویلایەتـی بەغـداد لـە ناحیـەی دەلـی عەبـاس جێگیـرن، بلۆکـی شەشـەمی سـوارەش لـە قـەزای مەندەلـی جێگیـرن، هەروەهـا بلۆکـی پێنجەمـی سـوارە و نیـوەی بلۆکی پیـادەی مەندەلـی کـە لـە قـەزای خانەقیـن بـەکار دەهێنرێـن، لەگـەڵ نیـوەی بلۆکـی پیـادە گۆرینەوەیـان پـێ دەکرێـت، لـەم بارەیـەوە مەزبەتـە لـە فەرمانگـەی ژاندارمـە رێکخـراوە و رەوان کـراوە، نـووسراوی سەرعەسـکەری واڵاش راگەیەنـدراوە و پێشـکەش کـراوە، لـەم بابەتـەدا جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا چ بفەرمووێـت جێبەجـێ دەکرێـت، بـە راگەیاندنـی نـووسراو کـراوە ئەفەنـدم.
سەدری ئەعزەم



İ.AS.00069.00018.001

| İ.AS | 00069.00018 | 29 شەوال 1325/ 5 كانوونی یەكەم 1907 |
|---|---|---|

پایەی سەرعەسكەر
فەرمانگەی ژاندارمە
١٠٧٩
راگەیاندراوی بەندەمانە
تابووری دووەمی ئاڵای ژاندارمەی ویلایەتی بەغداد لە ناحیەی دەلی عەباس و بلۆكی شەشەمی سوارە لە مەندەلی جێگیرن، لەگەڵ بلۆكی پێنجەمی سوارە و نیوەی بلۆكی پیادەی مەندەلی كە لە قەزای خانەقین جێگیرە لەگەڵ نیوەی بلۆكی پیادە گۆرینەوەیان پێ بكرێت، لەم بارەیەوە مەزبەتە لە ئەنجوومەنی ئاڵا رێكخراوە و لە ئەنجوومەنی كارگێری ویلایەت پەسەند كراوە و هاوپێچ رەوان كراوە، بە راگەیاندنی نووسراو هاتووە ئاماژە بە جێبەجێ كردنی كارەكە دەكات، جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمان كارەكە یەكلایی دەكاتەوە، بە تێروانین لە بابەتەكە بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم كەسەیە كە فەرمانی بەدەستەوەیە.
رزا سەر عەسكەر



İ.PT.00023.00047.002

| 9 جەمادی یەکەم 1325/ 20 حوزەیران 1907 | 00023.00047 | İ.PT |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
١٥٦٤
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
نووسراوی نەزارەتی ناوخۆی شکۆدار حەواڵەی شورای دەوڵەت کراوە، لەم بارەیەوە مەزبەتە لە فەرمانگەی داراییش ڕێکخراوە بە هاوپێچ راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، خانەی تەلەگراف و پۆستەی خانەقین کە دەکەوێتە سەر سنووری ئێران بە دەرخستە و کەم کردنەوە بری ٦٤٠٠ قوروش خەرجی نۆژەن دەکرێتەوە، هەروەها برە پارەی دیاریکراو لە ڕێکخستنی دەرماڵەی نۆژەنکردنەوەی بیناپەی ئەم ساڵە ڕێك دەخرێت، بۆ ئەم مەبەستەش پێویستە لە نەزارەتی ناوهاتوو ئاگاداری حەواڵەی نەزارەتی پۆستە و تەلەگرافی پایەبەرز بکرێت، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.




İ.RSM.00028.00048.002

| İ.RSM | 00028.00048 | 16 رەجەب 1325/ 25 ئاب 1907 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
٢٣١٣
جەنابی پاپەیەبەرزی ئەفەندم
نووسراوی رسوماتی ئەمانەتی شکۆدار حەواڵەی شورای دەوڵەت کراوە، هەروەها مەزبەتەی ڕێکخراوی فەرمانگەی دارایی ڕاگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، بۆ ئەم شوێنانەی لە فەرمانگەی رسوماتی خانەقین سەر بە ویلایەتی بەغداد، کە پێویستی بە نۆژەن کردنەوەیە، بە گوێرەی دەرخستە بری ٢٩,١٥ قوروش دیاریکراوە، ئەم برە پارەیەش لە ڕێکخستنی دروست کردن و نۆژەنکردنەوەی ئەم ساڵەدا دابین بکرێت، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە ڕاگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.



| 14 جەمادی یەکەم 1326/ 14 حوزەیران 1908 | 003335.250114 | BEO |
|---|---|---|

بۆ رسوماتی ئەمانەتی شکۆدار
عەبدولـرەزاق ئەفەنـدی بەڕێوەبـەری رسـوماتی مەندەلـی لـە بەڕێوەبـەری رسـوماتی خانەقیـن، هەروەهـا شـاکر ئەفەنـدی فەرمانبـەری رسـوماتی موسـڵ لـە بەڕێوەبـەری رسـوماتی مەندەلـی ئەرکەکەیـان پەسـەند کـراوە، لەسـەر نـووسراوی ١ جەمـادی یەکـەم ١٣٢٦ ژمـارە ١٠٧ حەواڵـە کـراو بـە مەزبەتـەی قۆمیسـیۆنی فەرمانبەرانـی مولکیـە باسـکراوە، هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی.

BEO.003254.243981.001

| 15 موحەررەم 1326/ 18 شوبات 1908 | 003254.243981 | BEO |
| --- | --- | --- |
| شیفرە بۆ ویلایەتی بەغداد<br>لە ٥ شوبات ١٣٢٣، بۆ لێکۆڵینەوە لە تێپەربوون و ئامادەکردنی باری ئێران، بریارە تابووری رەدیف رەوانی خانەقین بکرێت، پێویستە بە پەلە کارەکە جێبەجێ بکرێت. | | |



| 2 ڕەبیعی یەکەم 1326/ 4 نیسان 1908 | 003285.246328 | BEO |
|---|---|---|

بۆ وەکالەتی ویلایەتی دیاربەکر
لە ٢٦ شوبات ١٣٢٣، ئەم نیزامیەی دەچێتە خانەقین و ئەم تابوورانەی ڕەدیف کە دەچێتە شوێنی ئەوان، لە خاڵی سەربازی زیاد دەکرێن، بۆ خەرجی ئەندامانی ڕۆیشتوو بری پارە ڕێکخراوە و نابێ کێشە دروست بێت.بە ئاماژەی نەزارەتی دارایی ڕاگەیەندراوە.




BEO.003286.246420.001

| BEO | 003286.246420 | 4 رەبیعی یەکەم 1326/ 6 نیسان 1908 |
|---|---|---|

بۆ ویلایەتی سیواس

تابـوری رەدیفـی سـیواس دەچێتـە خانەقیـن، ژمـارەی ئاژەڵەکانیـان راگەیانـدراوە و پێویسـت بـە فرۆشـتنی نەکـراوە، هەروەهـا بـۆ کۆکردنـەوە و رەوان کردنـی تابوورەکـە، بـە فەرمانـی پاشـا گشـت پێداویسـتی ئامـادە بکرێـت، هەروەهـا پشـت بەسـتن بـە یاسـانامەی گواسـتنەوەی سـەربازی ئاژەڵەکانـی ناوهاتـووش بفرۆشرێـت و زانیاریـش بدرێتـە لایەنـی واڵای سـەر عەسـکەر.



| 20 جەمادی کۆتایی 1326/ 20 تەمموز 1908 | 003360.251926 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
ساڵح پاشا قائیمقامی قەزای خانەقین لە قائیمقامیەتی قەزای ئەبوعەریش، لە شوێن ئەویش خالد ئەفەندی قائیمقامی پێشووی قەزای میترۆفیچە دامەزرێن، بۆ ئەم مەبەستە نووسراوی مێژووی ٢٦ جەمادی یەکەم ١٣٢٦ ژمارە ١٤٥١ بە بڕیاری قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت، لە مێژووی ١٩ جەمادی کۆتایی ١٣٢٦ ڕەزامەندی نیشان دراوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.



| 9 رەجەب 1326/ 7 ئاب 1908 | 003372.252855 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دارایی شکۆدار
بـۆ سـەر لـە نـوێ دروسـت کردنـی دووکـەڵ خانـەی خانەقیـن، بـە پێویسـت زانـراوە ٢ چـاڵ هەڵکەندرێـت، بـۆ دەرخسـتە و کەمکردنەوەکەشـی بـری ٣،٣٥٠ قـوروش خەرجیەکـەی بـووە، بـری پـارەی ناوهاتـوو لـە ئـەم ساڵەدا لـە دەرماڵـەی تەندروسـتی هەژمـار کـراوە، لـە بـارەی حەواڵـە کردنـی بـۆ ویلایەتـی بەغـداد، لـە نەزارەتـی تەندروسـتی شـکۆدار نـووسراوی مێـژووی ٦ رەجـەب ١٣٢٦ ژمـارە ٦٥ هاتـووە و لەگـەڵ هاوپێـچ بـۆ سـەروو رەوان کـراوە، هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی و ناردنـەوەی هاوپێچـەکان.



BEO.003276.245644.001

| BEO | 003276.245644 | 19 سەفەر 1326/ 23 مارت 1908 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دارایی شکۆدار
هاوپێچ نووسراوی مێژووی ٩ سەفەر ١٣٢٦، تابووری سێیەم سەر بە ئاڵای ٣١ ڕەوانی خانەقین دەکرێت، لە ویلایەتی بەتلیس دابین کردنی خەرجی ڕۆیشتنی تابوورەکە بە مەحاڵ نیشان دراوە و لە موشیرەتی لەشکری چوارەمی هومایۆن ڕاگەیەندراوە، خەرجی تابووری ناوهاتوو و خەرجیەکانی تر بەپەلە جێبەجێ بکرێت، ئەمجارە لە والای سەر عەسکەر نووسراوی مێژووی ١٦ سەفەر ١٣٢٦ ژمارە ٢٩ هاتووە و هاوپێچ بۆ سەروو بەرز کراوەتەوە، بە تێروانین لە بەراییەکان و ئاماژەکانی پێشوو جێبەجێ بکرێت و ڕابگەیەندرێت، هاوپێچەکانیش ڕەوان بکرێتەوە.




١٤٩٥



BEO.003372.252855.002

<table>
<tr><td>BEO</td><td>003372.252855</td><td>25 رەمەزان 1326/ 21 تشرینی یەکەم 1908</td></tr>
<tr><td colspan="3">نەزارەتی کاروباری دارایی<br>خەرجی ژمێریاری<br>١٤٩٥<br>راگەیەندراوی بەندەمانە<br>نووسراوی مێژووی ٢٨ تەمموز ١٣٢٤ ژمارە ١٧٩٧ ی پەیوەندیداری سەدارەتی جەنابی پاشا ئاماژەی پێکراوە، بۆ دروست کردنی دووکەڵخانەی خانەقین، پێویستی بە هەڵکەندنی دوو چاڵ هەیە و خەرجیەکەشی ٣٣٥٠ قوروش دەکات، ئەم برە پارەیەش لە دەرماڵەی فەرمانگەی تەندروستی بۆ ساڵی ١٣٢٤ هەژمار کراوە، حەواڵەنامەکە و نووسراوەکەی رەوانی نەزارەتی تەندروستی شکۆدار کراوە، لە وەڵامی جەنابی پاشا، نووسراو لە ژمێریاری خەرجی ئامادەکراوە و هاوپێچ پێشکەش کراوە و رەوان کراوەتەوە، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بەدەستەوەیە.<br>نازری دارایی محەمەد رزا</td></tr>
</table>



BEO.003299.247384.001

| BEO | 003299.247384 | 23 رەبیعی یەکەم 1326/ 25 نیسان 1908 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دارایی شکۆدار

١٤ تابوور لە وەزنە بۆ خانەقین ڕەوان دەکرێت، لە دیاربەکریش جادر و پێداویستی ڕەوان دەکرێت، هەروەها پێداویستی وەکو جلوبەرگ دەکڕدرێت و ئامادە دەکرێت، بۆ ئەم کارەش قۆمیسیۆنێك دادەمەزرێت و یەك ملیۆن و ٣٥٠ هەزار قورۆش لە رسوماتی مەڕوماڵاتی ئەم ساڵەدا ڕێك دەخرێت، بۆ جێبەجێ کردنی ئاماژە دراوەتە والای سەر عەسکەر، لە ئێستاوە لە موشیرەتی شکۆدار نووسراوی بۆ کراوە، بە دامەزراندنی قۆمیسیۆنەکە دەستپێشخەری دەکرێت و مامەڵەی سەرەتایی ئەنجام دەدرێت، لەبارەی دابین کردنی کەلوپەل و ڕێکخستنی پارەکەی لە وەکالەتی والی دیاربەکر تەلەگرافنامە لە مێژووی ١٠ نیسان ١٣٢٤ هاوپێچ بۆ سەروو نێردراوە، لە بابی عالی بە وردبینی کردن کارەکە جێبەجێ بکرێت و ئەنجامەکەی ڕابگەیەندرێت و هاوپێچەکانیش ڕەوان بکرێتەوە.



İ.PT.00025.00031.002

<table>
<tr><td>İ.PT</td><td>00025.00031</td><td>15 سەفەر 1326/ 19 مارت 1908</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەت<br>دیوانی هومایۆنی ئێستا<br>٥٨٧<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>لەسەر نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆ کە حەواڵەی شورای دەوڵەت کراوە، مەزبەتە لە فەرمانگەی دارایی رێکخراوە، بە هاوپێچەوە راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لە نێوان دەوڵەتی عوسمانی و حکوومەتی ئێران مقاوەلەنامەی پۆستە رێکخراوە، بە پشت بەستن بە بریارنامە، مەرکەزی بایەزید و خانەقین دانراوە، هەر یەکە بە مووچەی ٥٠٠ قوروش و شارەزا لە زمان دوو فەرمانبەر دادەمەزرێت، هەروەها مووچەی باسکراو لە بودجە زیاد دەکرێت، بۆ ئەمەش ئاگاداری دراوەتە نەزارەتی پۆستە و تەلەگراف، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.</td></tr>
</table>




| BEO | 003487.261517 | 3 موحەررەم 1327/ 25 کانوونی دووەم 1909 |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>وێنەکانی لە باڵادا تۆمار کراوە، مەزبەتەی فەرمانگەی مولکیەی شورای دەوڵەت و نووسراوی ڕاگەیەندراو و فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە پەراوێز دەریخستووە، لە نەزارەتی ناوەخی شکۆدار هیممەت بکرێت.<br><br>قائیمقامی پێشووی قەزای خانەقین ساڵح پاشا دراوەتە دادگا. | | |




| BEO | 003585.268810 | 8 جەمادی کۆتایی 1327/ 27 حوزەیران 1909 |
|---|---|---|

بۆ لایەنی عالی نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
وەڵامی نووسراوی مێژووی ١١ حوزەیران ١٣٢٥ ژمارە ١٣٦١، قوماندانی ژاندارمەی بەغداد رەوانی قەزاکانی کوتولئیمارە و خانەقین کراوە، بەڵام روون نەبۆتەوە بۆ چ لێکۆڵینەوەیەك رۆیشتووە، ئەگەر بۆ کاروباری زەبتیە بێت، ئەوا خەرجی رێگا نادرێت، لە وەکالەتی ویلایەتی بەغداد خوێندنەوەی بۆ بکرێت و ئەنجامی رابگەیەندرێت.




BEO.003588.269062.001

<table>
<tr><td>BEO</td><td>003588.269062</td><td>11 جەمادی کۆتایی 1327/ 30 حوزەیران 1909</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ نەزارەتی جەنگی پایەبەرز<br>وێنەی نووسراوی راگەیەندراو لە باڵا تۆمارکراوە و بەگوێرەی پەراوێزی فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت لە نەزارەتی جەنگی پایەبەرز جێبەجێ بکرێت.<br><br>لە بارەی سزادانی رزا چاوش برای هاوژینی ئیسماعیل بەگ بینباشی تابووری ژاندارمەی خانەقین.</td></tr>
</table>



BEO.003640.272930.001

| 7 رەمەزان 1327/ 22 ئەیلوول 1909 | 003640.272930 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی مەعاریفی پایەبەرز
وێنەی مەزبەتەی فەرمانگەی دارایی و نافیعە و مەعاریفی شورای دەوڵەت لە باڵا تۆمار کراوە، لە نەزارەتی مەعاریفی پایەبەرز هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.

لە بارەی مووچەی مەکتەبە سەرەتاییەکانی خانەقین و حللە و مەندەلی لەگەڵ بەرێوەبەرایەتی هیت، لە بەشی پارەی هاوکاری هەژمار کراوە.

T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
BEO
3655 274079 1

BEO.003655.274079.001

| BEO | 003655.274079 | 15 شەوال 1327/ 30 تشرینی یەکەم 1909 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار
لەلایەن ئێرانەوە بینباشی رەدیفی قەزای خانەقین تووشی هێرش بۆتەوە، ئەم کارەش لە باڵیۆزخانەی تەهران بە ئاگاداری حکوومەتی ئێران کراوە، لە وەڵامی نووسراوی مێژووی ١٣ تشرینی یەکەم ١٣٢٥ ژمارە ١١٤٢ بە دەوڵەت راگەیەندراوە، بە چاودێری کردنی دەستپێشخەریەکان ئەنجام بدرێت و داواکاری رابگەیەندرێت و هیممەت بکرێت لە ئاماژە پێکردنی.



I.AS.00086.00030.004

| İ.AS | 00086.00030 | 9 جەمادی کۆتایی 1327/ 28 حوزەیران 1909 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
٥٩٣
جەنابی بەمیهرەبانی ئەفەندم
تابووری ژاندارمەی خانەقین بینباشی ئیسماعیل بەگ لەگەڵ برای هاوژینەکەی رزا چاوش، بە هاوبەشی دارکاری کاتیب تاڵب ئەفەندی و ئەمینی بلۆك حوسێن کوڕی غەفوریان کردووە، لە ناوبراوان بینباشی ئیسماعیل بەگ بە گوێرەی سزای یاسانامەی هومایۆن ماددەی ١١٣ ی بڕیارەکان بۆ ماوەی ٣ مانگ لە تابوورەکە بگۆردرێت، رزا چاوشیش بە گوێرەی یاسانامەی باسکراو بە ماددەی ١٠٣ بۆ ماوەی ١٢٠ رۆژ بە شێوەیەکی ئاسایی ٨ مانگیش بە کۆت و زنجیر لە گرتووخانە دەمێنێتەوە، حوسێن کوڕی غەفوریش بە یاسانامەی باسکراو بە ماددەی ٩٨ بۆ ماوەی ٣٠ رۆژ، جگە لەمەش ١٥ رۆژ بە کۆکراوەیی ٤٥ رۆژ زیندانی دەکرێت، نووسراوی نەزارەتی جەنگی پایەبەرز هاوپێچ راگەیەندراوە و بەرز کراوەتەوە، جەنابی پاشا بە فەرمانی پاشا چ بفەرموێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.
سەدری ئەعزەم

BEO.003763.282195.001

| BEO | 003763.282195 | 3 جەمادی کۆتایی 1328/ 12 حوزەیران 1910 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی جەنگی شکۆدار
وەڵامی نووسراوی مێژووی ٣٠ ئاب ١٣٢٥ ژمارە ٢٠٨٤ی نەزارەتی شکۆدارە، بینباشی رەدیفی خانەقین لەگەڵ هاوەڵانی هەستاون بە دەستگیر کردنی چەتەکان، هەروەها ئەو کەلوپەلەی پەیوەستە بە بینباشی و ژاندارمەکان رادەست کراونەتەوە، لە بارەی رادەست کردنی ئەوەی ماوەتەوە دەستپێشخەری کراوە، لە باڵیۆزخانەی تەهران لەم وەڵامەی هاتووە نووسراوی مێژووی ٢٤ مایس ١٣٢٦ ژمارە ٢٨٥ی نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار وەڵام دراوەتەوە.

T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARSIVI
BEO

BEO.003731.279772.001

| 28 ڕەبیعی یەکەم 1328/ 9 نیسان 1910 | 003731.279772 | BEO |
|---|---|---|
| بۆ لایەنی عالی جەنابی پەیوەندیداری مەشیخەت و نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار لەلایەن نائیبەکانی حللە و هندیە و سەماوە و کازمیە و خانەقینی سەر بە ویلایەتی بەغداد تەلەگرافنامە لە بەغداد دەرچووە و تێدا رایانگەیاندووە بە ناحەقی لە کارەکەیان دوور خراونەتەوە و زوڵمیان لێکراوە، هاوپێچ بۆ پەیوەندیداری مەشیخەت بەرز کراوەتەوە، لەگەڵ تەلەگرافنامەی ناوەخۆ هاوپێچ بۆ سەروو بەرز کراوەتەوە، لە پەیوەندیداری فەتوای والا زانیاری رادەگەیەندرێت. | | |



BEO.003831.287299.001

| BEO | 003831.287299 | 1 زیلحیجە 1328/ 4 کانوونی یەکەم 1910 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
ئەمین شوکری ئەفەندی لە قائیمقامیەتی قەزای دلیم سەر بە ویلایەتی بەغداد جیابۆتەوە و لە قائیمقامیەتی قەزای خانەقین دامەزراوە، بەڵام دوای لێکۆڵینەوە دەرکەوتووە بەهۆی چالاکییە نەگونجاوەکانی دوور خراوەتەوە و لە شوێن ئەو عینایەتوڵڵا ئەفەندی دامەزرێت، لەم بارەیەوە لەسەر نووسراوی مێژووی ١٦ تشرینی دووەم ١٣٢٦ ژمارە ٢٠١١ بە فەرمانی پاشای جەنابی پاشا لە مێژووی ١٨ تشرینی دووەم ١٣٢٦ رەزامەندی نیشان داوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.



DH.H.00019.00005.003

| DH.H | 00019.00005 | 16 ڕەمەزان 1328/ 21 ئەیلوول 1910 |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی کاروباری دەرەوە
بەڕێوەبەرایەتی کاروباری سیاسی گشتی
قەڵەمی فەرمانگە و ویلایەتەکان
ژمارە ٨٤٨
نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
پوختە: لە بارەی سەرۆکی باجەلان کەریم خان، هاوپێچ ١
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم

فەرمانبەری دەیەك یوزباشی عەلی ئەفەندی دەستی بەسەر زەوییەکانی سەرۆکی عەشیرەتی باجەلان کەریم خان لە ناحیەی بینقۆدرەی سەر بە خانەقین داگرتووە و داهاتەکەی بۆ خۆی بردووە، بەم ڕاگەیەندراوە ڕێگە نەدرێت کاری لەم شێوەیە ئەنجام بدرێت، لەلایەن حاکمی کرمانشا بە ڕاپۆرت ئاماژەی پێکراوە، لە کاتی لێکۆڵینەوەکان دەرکەوتووە، کەریم خان پێش ٢٠ ساڵ بەهۆی خیانەتکارییەوە لەگەڵ هاوەڵانی هەڵاتووە و چۆتە ئێران، بۆیە گەڕانەوەیان بۆ دەوڵەتی عوسمانی هیچ سوودێکی نابێت، لەبارەی زەوییەکانی کەریم خان بە چ جۆرێك حاکمی ناوهاتوو وەڵامی داوەتەوە، نووسراوی شەهبەندەری کرمانشا لە مێژووی ٣١ تەمموز ١٣٢٦ ژمارە ٢٨ نێردراوە و وێنەیەکی خوێندنەوەی بۆ کراوە، تاکا دەکەم ئاماژەی پێ بکرێت، بڕیار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بە دەستەوەیە.

ڕاوێژکار بە ناوی نازری دەرەوە



| İ.DH | 01485.000015 | 28 زیلقەعدە 1328 /1 کانوونی یەکەم 1910 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
قەڵەمی ئەنجوومەنی وەکیلەکان و داواکارییەکان
٣٥٧٤
جەنابی بە میهرەبانی ئەفەندم
ئەمین شوکری ئەفەندی لە قائیمقامیەتی قەزای دلێم سەر بە ویلایەتی بەغداد جیاکراوەتەوە و لە قائیمقامیەتی قەزای خانەقین دامەزراوە، بەڵام دوای لێکۆڵینەوە لە خراپەکاریەکانی، ناوبراو دووربخرێتەوە و لە شوێن ئەو عینایەتوڵڵا ئەفەندی قائیمقامی قەزای رجالوئەلمەع دابمەزرێت، نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.



| 28 جەمادی یەکەم 1329/ 27 مایس 1911 | 003898.292346 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
عینایەتوڵڵا ئەفەندی قائیمقامی قەزای خانەقین سەر بە ویلایەتی بەغداد لە قائیمقامبەتی قەزای عەزیزیە، محەمەد بەگ قائیمقامی عەزیزیە لە قائیمقامیەتی کوتولئیمارە، راسم ئەفەندی قائیمقامی کوتولئیمارە لە قائیمقامیەتی خانەقین بگوازرێنەوە و دەست بە کار بن، بۆ ئەم مەبەستە لەسەر نووسراوی مێژووی ٩ مایس ١٣٢٧ ژمارە ٦٦٧ فەرمانی پاشای جەنابی پاشا لە مێژووی ١٢ مایس ١٣٢٧ ڕەزامەندی نیشان داوە، لەم بابەتەدا وێنەی پەسەندکراوی بریارنامە هاوپێچ ڕەوان کراوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.

| 6 زیلقەعدە 1329/ 29 تشرینی یەکەم 1911 | 003955.296600 | BEO |
| --- | --- | --- |

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
قائیمقامەکانی قەزای حللە و خانەقین سەر بە ویلایەتی بەغداد راشد پاشا و راسم بەگ گۆرینەوەیان پێ دەکرێت، بۆ ئەم مەبەستە لەسەر نووسراوی ١٠ تشرینی یەکەم ١٣٢٧ ژمارە ١٩٥٦، بە فەرمانی پاشای جەنابی پاشا رەزامەندی دراوە، لەم بابەتە وێنەی بریارنامەی پەسەند کراو بۆ سەروو بەرز کراوەتەوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.



| 2 زیلحیجە 1329/ 24 تشرینی دووەم 1911 | 003968.297526 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتەکانی جەنگی و دارایی شکۆدار
وەڵامی راپۆرتی مێژووی ٢٣ تشرینی یەکەم ١٣٢٧ ژمارە ٥٤٤ ی واڵایە، لە مێژووی ٣٠ تەمموز ١٣٢٦ مامەڵەی خانەنشینی عیززەت ئەفەندی مولازمی دووەم لە بلۆکی ١٤ ی تابووری چوارەمی خانەقینی ئاڵای ٨٢ رەدیفی سەر بە لەشکری شەشەمی هومایۆن ئەنجام دراوە، ئەوەی جێگەی باسکردنە مووچەی خانەنشینیەکەی بۆتە ٣١٨ قوروش، بۆ ئەم مەبەستە بریارنامە لە نەزارەتی جەنگی شکۆدار بۆ دارایی راگەیەندراوە و لە سەروو پەسەند کراوە، وێنەی پەسەندکراوەکەش هاوپێچ و بە نەزارەتی دارایی شکۆدار راگەیەندراوە.



DH.İD.00121.00009.005

| 3 زیلقەعدە 1329/ 26 تشرینی یەکەم 1911 | 00121.00009 | DH.İD |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
قەڵەمی شیفرە
شیفرەی وەرگیراوی ویلایەتی وان
شیفرەی ٢٧ ئەیلوول ١٣٢٧ ژمارە ٤٥٩٢، بە نۆژەنکردنەوەی تێلەکانی ئێران و ئەگەر بە ڕێگەی خانەقین پەیوەندییەکان ئەنجام بدرێن، ئەوا پێویست بە پۆستەچی ناکات، ئاماژەی پۆستە و تەلەگراف لە باش بەڕێوەبەرایەتی وان ڕاگەیەندراوە.
نازم وەکیلی والی

BEO.003843.288192.001

| 7 موحەررەم 1329/ 8 کانوونی دووەم 1911 | 003843.288192 | BEO |
| --- | --- | --- |

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
وەڵامی نووسراوی مێژووی ٢١ کانوونی یەکەم ١٣٢٦ ژمارە ٢٢٧٨، قەزاکانی مەندەلی و خانەقین لە نێوان دیجلە و فورات و هەم لەگەڵ ئێران سنوورە، ئاروا و ئاسقا رایانگەیاندووە لە نێوان ئەم دوو قەزایەدا نیازیان گەشت کردنە، لەگەڵ ئەمەش بەدوای کانزادا دەگەڕێن، هەروەها لە ویلایەتی بەغداد ئاماژەی پێکراوە بە یاسای تایبەت لەگەڵ ئەندازیار رۆدۆلف تولونس مامەڵەی گەران بە دوای کانزا دەکەن، لە کاتی گەشتەکەش بە رێککەوت کانزایان دۆزیوەتەوە، بۆ هاوکاری کردنی ئەمانە ئاگاداری بدرێتە ویلایەتی ناوهاتوو.



İ.HB.00102.00035.004

<table dir="rtl">
<tr><td>İ.HB</td><td>00102.00035</td><td>30 زیلقەعدە 1329/ 22 تشرینی دووەم 1911</td></tr>
<tr><td colspan="3">نەزارەتی جەنگی<br>فەرمانگەی تەحریرات<br>قەڵەمی تەحریرات<br>٢١٧٠<br>بریارنامە<br>لـە مێـژووی ٣٠ تەممـوز ١٣٢٦ مامەڵـەی خانەنشـینی عـزەت ئەفەنـدی مولازمـی دووەم لـە تابـووری چوارەمـی خانەقینـی ئـاڵای ٨٢ی رەدیـف سـەر بـە لەشـکری شەشـەمی هومایـۆن جێبەجـێ کـراوە، بـۆ خانەنشینیەکەشـی ٣١٨ قـوروش دابیـن کـراوە.<br>نازری جەنگی سەدری ئەعزەم</td></tr>
</table>




İ.HB.00083.00011.005

<table dir="rtl">
<tr><th>İ.HB</th><th>00083.00011</th><th>8 رەبیعی کۆتایی 1329/ 8 نیسان 1911</th></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەت<br>قەڵەمی ئەنجوومەنی وەکیلەکان و داواکاریەکان<br>٢٤٦<br>جەنابی بە میهرەبانی ئەفەندم<br>میری لیوا کانی پاشا قوماندانی فرقەی ئەنقەرە سەر بە سەرپەرشتیاری یەکەمی رەدیف مانگانە ٤٨٠٠ قوروش، وەستا محەمەد تفەنگچی لە تابووری چوارەمی خانەقینی ئالای ٨٢ی رەدیف سەر بە لەشکری شەشەمی هومایۆن ٥١٥ قوروش مووچە و بە یاسای خانەنشینی، مووچەی کانی پاشا لە ئەنقەرە و مووچەی وەستا محەمەد لە بەغداد رێك دەخرێت، بۆ ئەم مەبەستە راپۆرت و هاوپێچی نەزارەتی جەنگی شکۆدار لەگەڵ بریارنامە راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، جەنابی پاشا بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.</td></tr>
</table>



| 3 جەمادی یەکەم 1330/ 17 مایس 1912 | 004029.302160 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی جەنگی شکۆدار
چاوشی نووسین خالد کوڕی محەمەد لە لیوای یەکی سوارەی عەشیرەت بووە، دواتر بە پلەی کاتیبی تابووری ژاندارمە لە تابووری کیتابەتی خانەقین سەر بە ئاڵای ژاندارمەی بەغداد دامەزراوە، نووسراوی مێژووی ٢٨ مارت ١٣٢٨ ژمارە ١٣٧ ڕێکخراوە، لیستی فەرمانی پاشا بە واژووی جەنابی پاشای هومایۆن پەسەند کراوە، وێنەی پەسەند کراوی هاوپێچ ڕەوان دەکرێت، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.



| 15 رەجەب 1330/ 30 حوزەیران 1912 | 004058.304289 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی جەنگی و نەزارەتی دارایی شکۆدار
حەسەن ئەفەندی یوزباشی لە بلۆکی ١٣ی تابووری چوارەمی خانەقینی ئالآی ٨٢ی سەر بە لەشکری شەشەمی رەدیف خانەنشین کراوە، مووچەکەی بۆتە ٩٢١ قوروش، بۆ ئەم مەبەستەش راپۆرتی مێژووی ٣ حوزەیران ١٣٢٨ ژمارە ١٦٣ رێکخراوە و رەوانی والآ کراوە، لەگەڵ لیستی فەرمانی پاشا کە بە واژووی جەنابی پاشای هومایۆن پەسەند کراوە، وێنەی پەسەندکراوی هاوپێچ ئاگاداری دراوەتە نەزارەتی دارایی شکۆدار.



BEO.004084.306266.001

| BEO | 004084.306266 | 4 شەوال 1330/ 16 ئەیلوول 1912 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار
هاوپێچ نووسراوی مێژووی ٢٧ ئاب ١٣٢٨، چەتەکانی ئێران لە ناو قەزاکانی خانەقین و مەندەلی سەرپێچی و هێرشیان ئەنجام داوە، بەمەش بارودۆخی ویلایەت لە رووی ئەمنیەت و ئاسایشەوە تێك دەچێت، بۆ رێگەگرتن لەم رووداوانە بە درێژایی سنوور هێزی پێویست دابنرێت، ئەم بابەتە بە گرنگیەوە لە وەکالەتی ویلایەتی بەغداد ئاماژەی پێکراوە، دەستپێشخەری لە نەهێشتنی چەتەیی و تاوان لە نەزارەتی جەنگی شکۆدار ئامۆژگاری دراوەتە نەزارەتەکان، هەروەها لە نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار نووسراوی ٢٨ ئاب ١٣٢٨ ژمارە ١٥٤٠ بۆ سەروو بەرز کراوەتەوە، هەرچی زووە بە پەلە کێشەکە چارەسەر بکرێت و رابگەیەندرێت و هاوپێچەکان رەوان بکرێتەوە.



İ.HB.00111.00036.004

| İ.HB | 00111.00036 | 1 جەمادی یەکەم 1330/ 18 نیسان 1912 |
|---|---|---|

نەزارەتی جەنگی
فەرمانگەی تەحریرات
قەڵەمی تەحریرات
٣٦٤
فەرمانی سەدری ئەعزەم
خالـد کـوڕی محەمـەد چاوشـی نووسـین لـە لیـوای حەوتەمـی سـوارەی عەشـیرەت، بـە پلـەی کاتیبـی تابـووری ژاندارمـە لـە کیتابەتـی تابـووری خانەقیـن سـەر بـە ئـاڵای ژاندارمـەی بەغـداد دادەمەزرێـت، بـۆ جێبەجـێ کردنـی فەرمانـی پاشـا نەزارەتـی جەنگـی ئەرکـی پـێ سـپێردراوە.
نازری جەنگی　　　　سەدری ئەعزەم



BEO.004157.311736.001

| BEO | 004157.311736 | 16 رەبیعی کۆتایی 1331/ 25 مارت 1913 |
|---|---|---|
| لایەنی پایەبەرزی نەزارەتی جەنگی شکۆدار<br>هاوپێچی نووسراوی مێژووی ٦ مارت ١٣٢٩، ئەم منارانەی دەکەونە ناوچەی سنووری خانەقین، لەلایەن عەشیرەتەکانی ئێران هێرشی گراوەتە سەر، بۆ ئەم مەبەستەش لەلایەن وەزارەتی کاروباری دەرەوە ئاگاداری دراوەتە باڵیۆزی تەهران و ئینگلتەرا، بە تێروانین لە بابەتەکە رووداوەکە هێرشی عەشیرەتەکانی ئێران بۆ سەر سەربازانی عوسمانی نییە، بەڵکو رووداوەکە لە ئەنجامی رووبەرووبوونەوەی عەشیرەتەکانی ئێرانی و عوسمانیەوە روویداوە، هەر چەندە فەرمان دوای فەرمان دەرچووە، بەڵام تا ئێستا وەڵام وەرنەگیراوە، بە گوێرەی ئاماژەی باڵیۆزخانەی تەهران بە نووسراو بە نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار راگەیەندراوە. | | |

BEO.004156.311643.001

| BEO | 004156.311643 | 13 ڕەبیعی کۆتایی 1331/ 22 مارت 1913 |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار<br>وەڵامی نووسراوی مێژووی ٤ مارت ١٣٢٩ ژمارە ٢٠، چەند گوندێك لە ناوچەی بلۆکی سنووری خانەقین لەلایەن عەشیرەتەکانی ئێران هێرشی کراوەتە سەر، تەلەگرافنامە لە قوماندانیەتی لەشکری قۆڵی ١٣ ڕەوان کراوە، ڕوون کراوەتەوە عەشیرەتی ئێران لەسەر مەسەلەی سنوور لە گفتوگۆدان، ئەم ماوەیە بۆ قەدەغەکردنی سەرپێچیەکانیشیان پێویستە لەلایەن حکوومەتی ئێرانەوە دەستپێشخەری بکرێت، نووسراوی مێژووی ٥ مارت ١٣٢٩ ژمارە ٢١ ی نەزارەتی جەنگی شکۆدار بۆ سەروو ڕەوان کراوە، جێبەجێ بکرێت و ئەنجامەکەی ڕابگەیەندرێت و هاوپێچەکانیش ڕەوان بکرێتەوە. | | |



BEO.004160.311962.001

| BEO | 004160.311962 | 24 ڕەبیعی کۆتایی 1331/ 2 نیسان 1913 |
|---|---|---|

بۆ لایەنی پایەبەرزی نەزارەتی جەنگی شکۆدار
وەڵامـی نـووسراوی مێـژووی ٥ مـارت ١٣٢٩ ژمـارە ٢١، ئـەو منارانـەی دەکەونـە ناوچـەی بلۆکـی سـنووری خانەقیـن لەلایـەن عەشـیرەتەکانی ئێرانـەوە هێرشـیان کراوەتـە سـەر، لـە وەزارەتـی کاروبـاری دەرەوە ڕێنمایـی دەرچـووە و لـە کۆتاییـدا وەڵام دراوەتـەوە ئێرانیـەکان، کـە سـەربازانی عوسـمانی لـە کاتـی پاراسـتنی چەتـەکان ڕووبەڕووبوونـەوە ڕوویـداوە، لـە هـەردوولا ٥-٦ کـەس کـوژراوە، لـە لێکۆڵینـەوەکان تۆمـار کـراوە و ئامـاژەی باڵیـۆزی تەهـران بـە نەزارەتـی دەرەوەی شـکۆدار ڕاگەیەنـدراوە.



BEO.004155.311561.001

| 9 رەبیعی کۆتایی 1331/ 18 مارت 1913 | 004155.311561 | BEO |
|---|---|---|

بۆ لایەنی سەرووی نەزارەتی جەنگی شکۆدار
وەڵامی نووسراوی مێژووی ٢١ شوبات ١٣٢٨ ژمارە ٣٤١٢، ئەو منارانەی دەکەوێتە ناوچەی بلۆکی سنووری خانەقین لەلایەن عەشیرەتەکانی ئێران سەرپێچی تێدا کراوە، بەمەش تا دێت سەرپێچیەکان زیادی کردووە، پێویستە ئەم جۆرە سەرپێچیانە قەدەغە بکرێت و چەکی میری رادەست بکرێتەوە، لەگەڵ تەلەگراف ئامۆژگاری فەرمان بە فەرمان ئاگاداری دەرچووە، بە ئاماژەی باڵیۆزی تەهران و لە وەڵامدا نووسراو لە نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار دەرچووە.



BEO.004155.311561.004

<table>
<tr><td>BEO</td><td>004155.311561</td><td>10 ڕەبیعی کۆتایی 1331/ 19 مارت 1913</td></tr>
<tr><td colspan="3">فەرمانگەی ئەرکانی جەنگی گشتی<br>هۆبەی ٤<br>لە مێژووی ٢٠ شوبات ١٣٢٨ شیفرە لەلایەن ئەسعەد پاشا قوماندانی لەشکری قۆڵی ١٢ی موسڵ هاتووە<br>ڕۆژی ١٤ی ئەم مانگە عەشیرەتی ئارالی ئێرانی هێرشیان کردۆتەوە سەر منارەکانی مەلکیلی و هەلەسورەی سنووری خانەقین و ئابلۆقەیان داوە، لە کاتژمێر ٨ تا ١٢ ڕووبەڕووبوونەوەیەکی توند ڕوویداوە، لە سەربازەکان ئۆنباشییەك و ٤ نەفەر کوژراوە و ئۆنباشییەکیش بریندار بووە و تفەنگەکانیان بردراوە، هەروەها ئەگەر لە ئێرانیەکان کوژراو و بریندار هەبوبێت هێشتا ژمارەیان نازانرێت، لە قوماندانیەتی بلۆکی باوەنوری سنوور ڕاگەیەندراوە.</td></tr>
</table>




BEO.004160.311962.003

| BEO | 004160.311962 | 9 رەبیعی کۆتایی 1331/ 18 مارت 1913 |
|---|---|---|

فەرمانگەی ئەرکانی جەنگی گشتی
هۆبەی ٤
ژمارە ٢١
پوختەی بابەت: لە ناوچەی بلۆکی سنووری خانەقین، لەلایەن عەشیرەتەکانی ئێران هێرش کراوەتە سەر چەند گوندێك و لە لەشکری قۆڵی ١٣ تەلەگرافنامە هاتووە و وێنەیەکی پێشکەش کراوە.

ڕاگەیەندراوی بەندەمانە
هاوپێچی نووسراوی مێژووی ٢١ شوبات ١٣٢٨ ژمارە ٣٤١٤.
چەند گوندێك لە ناوچەی بلۆکی سنووری خانەقین تووشی هێرشی عەشیرەتەکانی ئێران بوونەتەوە و تاڵانیان تێدا ئەنجام دراوە، لە ئەنجام ئەم عەشیرەتانە لەگەڵ ئەندامانی سەربازی سنوور ڕووبەڕووی یەکتر بوونەتەوە، نەفەرێکمان کوژراوە و نەفەرێکیشمان بریندار بووە، بۆ ئەمەش لە قوماندانیەتی لەشکری قۆڵی ١٣ تەلەگرافنامە هاتووە، وێنەیەکی هاوپێچ پێشکەش کراوە، لەسەر ڕاگەیەندنی زانیاری لەلایەن نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار، مەسەلەی سنوور و عەشیرەتەکانی ئێران گفتوگۆی لەسەرە، بۆ ڕێگەگرتن لە سەرپێچیەکانی ئەم دواییە لەگەڵ حکوومەتی ئێران دەستپێشخەری کراوە، بۆ ڕاگەیاندنی ئەنجامەکەی بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بەدەستەوەیە.
بە ناوی نازری جەنگی ڕاوێژکار ...............




DH.İD.00146.1.00055.002

| 7 ڕەبیعی کۆتایی 1331/ 16 مارت 1913 | 00146.1.00055.002 | DH.İD |
|---|---|---|

نەزارەتی داد و مەزهەبەکان
قەڵەمی تایبەت
ژمارە ٥
پوختە: لەسەر ڕێکخستنی کارگێری هەندێك لە قەزاکانی بەغداد
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم

لەبەر گرنگی قەزاکانی کەربەلا، نەجەف، کازمیە، سامەرا و خانەقین، هەروەها شوێنی جوگرافی قەزای سەماوە مامەڵەی بەدەری لەگەڵ کراوە، لە نەجەف تەواوکاری بۆ بکرێت و ئەوانی تریش بە شێوەیەکی قۆناغ بە قۆناغ بە ڕێکخستنی داد، سوودی سیاسی و کارگێری گەورەی بە دوای خۆیدا دێنێت، لە داواکاری گشتی تێهەڵچوونی ویلایەتی بەغداد شیفرەی تەلەگرافنامە هاتووە و وێنەکەی هاوپێچ پێشکەش کراوە، بە تیروانین لە بەراییەکان و پەیوەندی کردن بە ویلایەتی ناوهاتوو ئەنجامەکەی بخرێتە سەر و بە خوێندنەوەی پەیوەندیدارانی نەزارەت ئاماژەی پێ بکرێت، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بە دەستەوەیە.

بە ناوی نازری داد راوێژکار ................



| BEO | 004152.311358 | 8 رەبیعی کۆتایی 1331/ 17 مارت 1913 |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی دەرەوە
بەڕێوەبەرایەتی گشتی کاروباری سیاسی
ژمارە ١٥/٢٩٨٩٧
بۆ جەنابی پاشای جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت
پوختە: لەبارەی پروپاگەندەی دەستبەرداربوونی خانەقین و بەجێهێشتنی بۆ ئێران
ڕاگەیەندراوی بەندەمانە
ئێمە بۆ ئێران دەستبەرداری خانەقین نابین، بۆیە ڕووسیا نییەتی ئەوەیە ئێمە ناچار بکات دەستبەرداری بین، داواکراوە لەلایەن باڵیۆزی دەرسەعادەت لە ئوستورالیا لێکۆڵینەوە لەسەر ئەم پروپاگەندەیە بکات، بە شێوەیەکی نهێنی پرسیاری لە باڵیۆزی تەهران لە ئوستورالیا کردووە، بەڵام ووتوویەتی لەم بابەتەدا هیچ زانیارییەکی نییە، لەسەر تەلەگرافنامەی باڵیۆزی تەهران، لەسەر پروپاگەندەی باسکراو، ئەمین بەگ ئەفەندی زانیاری داوەتە باڵیۆزخانەی عوسمانی لە پترسبورغ و لەلایەن مۆسیۆ سازانوف ڕاگەیەندراوە پروپاگەندەکە بێ مانا و ڕاست نییە، ئەمجارە لە وەڵامدا لەلایەن جەنابی ئەحمەد خان پاشا تەلەگرافنامە هاتووە زانیارییەکە ڕادەگەیەندرێت، لەم بابەتەدا بڕیار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بەدەستەوەیە.
نازری دەرەوە محەمەد ........



BEO.004192.314375.001

| 27 رەجەب 1331/ 2 تەمموز 1913 | 004192.314375 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتەکانی دارایی و ناوەخۆی شکۆدار
بەهۆی گۆڕینی ڕێڕەوی ڕووباری ئەلوەند لە قەزای خانەقین سەر بە ویلایەتی بەغداد زەوی کشتوکاڵی دروست بووە، ئەم زەوییانەش دەکەوێتە سەر زەوی میری، حکوومەت ناتوانێت ئەم زەوییانە بخاتە سەر زەوی خۆی، چونکە بە تاپۆ عەبدولمەجید بەگ و گشت خاوەن زەوییەکان پروپاگەندەی خاوەنبوونی ئەم زەوییانەیان کردووە، بۆ ئەمەش نووسراوی مێژووی ١ تەمموز ١٣٢٨ ژمارە ٣٠ ی شورای دەوڵەت حەواڵەی والا کراوە، مەزبەتەش دراوەتە فەرمانگەی مولکیە و مەعاریف، وێنەی هاوپێچ بۆ سەروو بەرز کراوەتەوە، ئاگاداریش دراوەتە نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.



İ.DH.01497

| İ.DH | 01497.000004 | 11 موحەررەم 1331/ 21 کانوونی یەکەم 1912 |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
بەڕێوەبەرایەتی قەڵەمی فەرمانبەران
ژمارە ٢٤١٣
فەرمانی سەدری ئەعزەم
راشید پاشا قائیمقامی قەزای خانەقین لە کارەکەی دوور خراوەتەوە و لە شوێن ئەو حاجی نامق ئەفەندی قائیمقامی قەزای حللە و لە قەزای حللەش راسم ئەفەندی قائیمقامی رانیە بە گواستنەوە دامەزراون.

بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی پاشا نەزارەتی ناوەخۆ ئەرکی پێ سپێردراوە.

نازری ناوەخۆ　　　　سەدری ئەعزەم



| 11 ڕەبیعی یەکەم 1332/ 7 شوبات 1914 | 004256.319183 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
وەڵامی نووسراوی مێژووی ٢١ کانوونی دووەم ١٣٢٩ ژمارە ١٨٩٩، شەوکەت ئەفەندی قائیمقامی قەزای خانەقین لەگەڵ یوسف کەنعان ئەفەندی قائیمقامی قەزای دلیم گۆڕینەوەیان پێ بکرێت، لەم بارەیەوە جەنابی پاشا بە فەرمانی پاشا فەرموویەتی، وێنەی پەسەند کراوی هاوپێچ ڕەوان کراوە و جێبەجێ بکرێت.



| 20 سەفەر 1332/ 18 کانوونی دووەم 1914 | 004250.318718 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
وەڵامی نووسراوی مێژووی ١ کانوونی دووەم ١٣٢٩ ژمارە ١٧٦٤، شەوکەت ئەفەندی قائیمقامی دلیم لە قائیمقامیەتی خانەقین، یوسف کەنعان ئەفەندی قائیمقامی سامەرا لە قائیمقامیەتی دلیم، مومتاز ئەفەندی قائیمقامی پێشووی حەما لە قائیمقامیەتی سامەرا، بە مووچەی پلەی دووەم بگوازرێنەوە و دابمەزرێن، بۆ ئەمەش جەنابی پاشا بە فەرمانی پاشا رەزامەندی نیشان داوە، وێنەی پەسەند کراوی هاوپێچ نێردراوە.

| BEO | 004313.323434 | 10 زیلقەعدە 1332/ 30 ئەیلوول 1914 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
وەڵامی نووسراوی مێژووی ١٤ ئەیلوول ١٣٣٠ ژمارە ١١٣٦، یوسف کەنعان ئەفەندی قائیمقامی خانەقین لە قائیمقامیەتی قەزای شامیە، شەفیق ئەفەندی قائیمقامی مەندەلی لە قائیمقامیەتی خانەقین، محەمەد عەلی بەگ قائیمقامی پێشوو لە قائیمقامیەتی مەندەلی بگوازرێنەوە و دابمەزرێن، بۆ ئەمەش جەنابی پاشا بە فەرمانی پاشا رەزامەندی نیشان داوە، وێنەی پەسەند کراوی هاوپێچ بۆ سەروو بەرز کراوەتەوە.



DH.EUM.2.Şb.00002.00066.001

| DH.EUM.2.ŞB | 00002.00066 | 25 زیلحیجە 1332/ 14 تشرینی دووەم 1914 |
|---|---|---|

شیفرە بۆ ویلایەتی بەغداد
بەبێ ئامادەبوونیان دادگاییکردنەکەیان ئەنجام دراوە، بەڵام خورشید بەگ سەرۆکی عەشیرەتی دەلۆ و کورە براکەی حەسەن بەگ و براکەی کەریم بەگ ملکەچی خۆیان راگەیاندووە و لە خاڵێکی نێوان خانەقین و مەندەلی لە ناو سنووری دەوڵەتی عوسمانی و نزیك لە ئێران و بیابانی عەشیرەتەکانی ئێران نیشتەجێ بوونە، کە لەگەڵ عەشیرەتەکانی تری دەورووبەر ناگونجێت، ئایا ملکەچی ناوبراوان ئاسایشی سنووری عوسمانی دەپارێزێت، بۆیە لە بارەیانەوە چاودێری یاسایی دوا بخرێت و ئاگاداری بدرێتە نەزارەتی داد و بە نووسراوی سەدری ئەعزەم نووسراو کراوە.

| 17 سەفەر 1332/ 15 کانوونی دووەم 1914 | 00019.00063 | DH.H |
| --- | --- | --- |

بۆ ویلایەتی بەغدادی پایەبەرز
ساڵی پار لە مانگی زیلقەعدە رۆژی ٢٣، کورد جەمال شا کەرەم دانیشتوی شاری کەلهورە و لە خانەقین بە حەمباڵی سەرقاڵە، بەڵام هەموو ساڵ دەگەرێتەوە شاری خۆی، بۆیە داواکاری بەرز کردۆتەوە و داوای کردووە بە خۆرایی پاسەپۆرتی پێ بدرێت، داواکاریەکەی دراوەتە کارپەرداز، کەچی دواتر لەسەر زمان درێژی هێنراوەتە کارپەرداز، روون بۆتەوە عەقلی تەواو نییە، بەم شێوەیە لە نێوان دوو وولات لە پرسیار و وەڵامدا راپۆرتی باڵیۆزی ئێران دراوەتە نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار و وێنەی راپۆرتەکەش هاوپێچ پێشکەش کراوە، دواى لێکۆڵینەوە رابگەیەندرێت.

T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

BEO.004242.318127.001

| 27 موحەررەم 1332/ 26 کانوونی یەکەم 1913 | 004242.318127 | BEO |
| --- | --- | --- |

بۆ لایەنی پایەبەرزی نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار
بـە حوشـتر لـە نێـوان بەغداد-کرمانشـا کەلوپەلـی بازرگانـی دەگوازرێتـەوە، هەروەهـا لـە سـنووری خانەقین-کرمانشـا فەرمانبەرانـی ئێـران بـە نـاوی خـاوە بـە زۆری بـری ٦٢,١١٤ لیـرەی عوسـمانی لـە کەلوپەلـی بازرگانـی وەردەگـرن لەگـەڵ ئەمـەش باجـی هەشـت یەکـی حوشـترەکانیش وون دەکرێـن، بـۆ گەراندنـەوەی بـرە پـارەی ناوهاتـوو و رادەسـتکردنی بـە خاوەنەکانیـان، دوو داواکاری بـە مـۆر و واژووی خاوەنـی حوشـترەکان بەنـاوی عەبدولمەهـدی و سـاڵح ئەلرەشـید و هاوەڵانـی بـۆ سـەرۆکایەتی شـورای دەوڵەتـی شـکۆدار رەوان کـراوە، بـە بـەرز کردنـەوەی بـۆ سـەروو، بـە تێروانیـن لـە بابەتەکـە هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی.




İ.DH 1510/1332.Za/1

İ.DH.01510.00001.002

<table>
<tr><td>İ.DH</td><td>01510.00001</td><td>8 زیلقەعدە 1332/ 28 ئەیلوول 1914</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>نەزارەتی ناوەخۆ<br>بەڕێوەبەرایەتی فەرمانبەران<br>ژمارە ١٧٩٩<br>فەرمانی سەدری ئەعزەم<br>یوسف کەنعان ئەفەندی قائیمقامی خانەقین لە قائیمقامیەتی قەزای شامیە، شەفیق ئەفەندی قائیمقامی مەندەلی لە قائیمقامیەتی خانەقین، هەروەها محەمەد عەلی بەگ کە پێشووتر لە قائیمقامیەت کاری کردووە لە قائیمقامیەتی مەندەلی دابمەزرێن.<br><br>بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی پاشا نازری ناوەخۆ ئەرکی پێ سپێردراوە.<br><br>نازری ناوەخۆ          سەدری ئەعزەم</td></tr>
</table>




دائرهٔ صدارت امور مهمه قلمی



BEO.004337.325241.001

| BEO | 004337.325241 | 30 رەبیعی یەکەم 1333/ 15 شوبات 1915 |
|---|---|---|

نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
وەڵامی نووسراوی مێژووی ٣١ کانوونی دووەم ١٣٣٠ ژمارە ١٦٢٩، یوسف بەگ قائیمقامی قەزای شامیە و شەفیق بەگ قائیمقامی خانەقین گۆڕینەوەیان پێ بکرێت، لە کاتی راگەیاندنی فەرمانی پاشای، جەنابی پاشا فەرموویەتی، وێنەی پەسەند کراوی هاوپێچ بۆ لایەنی سەروو بەرز کراوەتەوە.






DH.İ.UM.00083.1.00001.55.021

| 19 جەمادی یەکەم 1333/ 4 نیسان 1915 | 00083.1.1.55 | **DH.İ.UM** |
|---|---|---|
| بابی عالی<br>نەزارەتی ناوەخۆ<br>دەستەی بەرێوەبەرایەتی پشکنینی کاروباری مولکیە<br>ژمارە ٩٥١<br>جەنابی پاشای پەیوەندیداری نەزارەت<br>لە خانەقین مامەڵەی کۆکردنەوەی سەرباز لەگەڵ ئامادەکاری بۆ دابین کردنی پێداویستی و گواستنەوەی سەربازان جێبەجێ دەکرێت، بۆ ئەمەش لە فەرمانگەی سەرپەرشتیاری مولکیەی بەغداد راپۆرت وەرگیراوە و زانیاری هاوپێچ پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بەدەستەوەیە.<br>یاریدەدەری بەرێوەبەری گشتی بە وەکالەت عەلی رەشید بەگ | | |



| 27 زیلقەعدە 1333/ 6 تشرینی یەکەم 1915 | 00089.4.00001.23 | DH.İ.UM |
|---|---|---|

تەلەگراف بۆ ویلایەتی بەغداد
بەهـۆی ئۆپەراسـیۆنی سـەربازی داهاتـی عەشـیرەتەکانی سـنجاب و گـۆران تووشـی لەناوچـوون بۆتـەوە، داوایـان کـردووە ئـەم ساڵە بـە مەرجـی رادەسـت کردنـی باجـی باغچـە و ئـاژەڵ و لەوەرانـدن، ڕێگەیـان پـێ بدرێـت لـە نزیـك کوێسـتانەکانیان و لـە نـاو قـەزای خانەقیـن، ئاژەڵەکانیـان بلەوەڕێنـن، لـە تەهـران بـە نەزارەتـی جەنگـی ڕاگەیەنـدراوە، بـەڵام دەرکەوتـووە لـە ناوەخـۆ غەدریـان لێنەکـراوە و خوێندنـەوە بـۆ داواکاریەکەشـیان دەکرێـت و ئەنجامەکـەی ڕادەگەیەندرێـت.



DH.İ.UM.EK.00008.00103.004

| 29 شەعبان 1333 /12 تەمموز 1915 | 00008.00103 | DH.İ.UM.EK |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
بەڕێوەبەرایەتی کارگێری ناوەخۆی گشتی
لـە کاتـی دیـاری کردنـی سـنووری ئێـران، ئـەم زەوییانـەی کـە بەسـتراوەتەوە بـە ئێمـە کانـزای قۆراتـۆ و مەیدانـی سـەر دیالـە دەخرێتـە سـەر خانەقیـن، بـۆ ئەمـەش لـە ویلایەتـی بەغـداد بـە پێویسـت زانـراوە، لـە پلـەی سـێپەم دوو ناحیـە بـە نـاوی مەعـدەن و مەیـدان ڕێـك بخرێـت، لـە بـارەی جێبەجـێ کردنـی کارەکـە لەگـەڵ بەڕێوەبەرایەتـی ژمێریـاری و فەرمانبـەران فەرمـان حەواڵـە بکرێـت، هـاوکاری جەنابـی پەیوەندیـداری نـەزارەت پێویسـتە.




BEO.004426.331892.001

<table>
<tr><td>BEO</td><td>004426.331892</td><td>14 شەوال 1334/ 14 ئاب 1916</td></tr>
<tr><td colspan="3">نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>وەڵامی نووسراوی مێژووی ٢٧ تەمموز ١٣٣٢ ژمارە ٤١٣، رەفعەت بەگ قائیمقامی قەزای عەلی ئەلغەربی لە قائیمقامیەتی قەزای خانەقین دامەزرێت، بۆ ئەم مەبەستە فەرمانی پاشای جەنابی پاشا فەرموویەتی، وێنەی پەسەندکراوی هاوپێچ بۆ لایەنی سەروو بەرز کراوەتەوە.</td></tr>
</table>



| 6 جەمادی کۆتایی 1334/ 10 نیسان 1916 | 004407.330495 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
وەڵامی نووسراوی مێژووی ٢٤ مارت ١٣٣٢ ژمارە ٨٦، رەئوف بەگ هەواڵگری قەڵەمی مەکتوبی ویلایەتی بەغداد لە قائیمقامیەتی خانەقین بە وەکالەت دامەزراوە و بە رێژەی سێ یەك مووچەی پێ بدرێت ئەفەندم.



| BEO | 004400.329948 | 19 ڕەبیعی کۆتایی 1334/ 24 شوبات 1916 |
| --- | --- | --- |

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
وەڵامی نووسراوی مێژووی ٧ شوبات ١٣٣١ ژمارە ١٠٨٦، قائیمقامەکانی قەزای خانەقین و کازمیە، یوسف کەنعان بەگ و تۆفیق بەگ گۆرینەوەیان پێ بکرێت، بۆ ئەم مەبەستە بە فەرمانی پاشا جەنابی پاشا ڕەزامەندی نیشان داوە، وێنەی پەسەندکراوی بۆ لای سەروو بەرز کراوەتەوە.



| 9 رەمەزان 1334/ 10 تەمموز 1916 | 004421.331566 | BEO |
|---|---|---|

بۆ وەکالەتی نەزارەتی دارایی شکۆدار
بـە بۆنـەی گواسـتنەوەی سـەرباز دەبـێ ڕێگـەی بەغداد-خانەقیـن نـۆژەن بکرێتـەوە ، بـۆ ئـەم کارەش دوو تابـووری بەکارهاتـوو جیاکراونەتـەوە، ئـەم کارەش پێویسـتی بـە ڕێکخسـتن و ناردنـی ٥٠٠٠ لیرەیـە، بـە تەلەگرافنامـەی ویلایەتـی بەغـداد ئامـاژەی پێکـراوە، کـە ڕێـگای ناوهاتـوو ڕێـگای گشـتییە و بـۆ نۆژەنکردنـەوەی ڕێـگای ناوهاتـوو، لـە بودجـە خەرجـی تـەواو دابیـن کـراوە، لـە نەزارەتـی نافیعـەی شـکۆدار نـووسراو کـراوە بـە پەلـە جێبەجـێ بکرێـت و رابگەیەندرێـت.




<table>
<tr><td>28 ڕەجەب 1334/ 31 مایس 1916</td><td>00089.9.00001.32</td><td>DH.İ.UM</td></tr>
<tr><td colspan="3">لە تەڵعەت بگ نازری ناوەخۆ بۆ تەڵعەت بەگ وەکیلی نازری جەنگی<br>بەرووبوومی شەکر، جۆ و خورما خانەقین، لە پێداویستی ناوەخۆ زیاترە، بۆیە ئەم زیادەیە بۆ بژێوی ڕۆژانە موجاهیدەکانی ئێران لە ڕۆژئاوای ئێران ڕەوان بکرێت، بەڵام لە کاتی قەدەغەکردنی ناردنی ئەم بەرووبوومانە، ڕێگەی کرمانشا داخراوە، بەم شێوەیەش موجاهدینی ناوهاتوو بێ ئەرزاق دەبن، بەم ڕاگەیاندنە بۆ دابین کردنی ئەرزاقی موجاهیدەکانی ئێران و ناردنی بەرووبوومەکە، نووسراو لە ویلایەتی بەغداد هاتووە، دوای خوێندنەوە ڕابگەیەندرێت.</td></tr>
</table>



BEO.004428.332028.001

| 30 شەوال 1334/ 3 ئاب 1916 | 004428.332028 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی جەنگی شکۆدار

بەبۆنەی گواستنەوەی سەرباز لە ڕێگەی بەغداد-خانەقین، بە ئاماژەی ویلایەتی بەغداد بۆ نۆژەنکردنەو و چاککردنەوەی ڕێگاکەش دوو تابوور ئەرکی پێدراوە، هەروەها بۆ کاری ڕێگاکە ٥٠٠٠ لیرە دابین کراوە و بۆ بەپەلە نۆژەنکردنەوی ڕێگای ناوهاتوو برە تێچووی کارەکە بە تەواوەتی دابین بکرێت، لە نەزارەتی نافیعەی شکۆدار رابگەیەندرێت و لە وەکالەتی نەزارەتی دارایی شکۆداریش ئاماژەی پێکراوە بری ٥٠٠٠ لیرەکە بە یاسای تایبەت یاخود بریارێکی تایبەت بدرێت، لە وەڵامدا هاتووە ڕێگای ناوهاتوو لە بودجەی نافیعە بە دەرماڵە زیاد کراو ئەستەمە و ئەوەی هەیە بەش ناکات، بەڵام لە تێروانینی خاڵی سەربازی ئەم ڕێگایانە گرنگی خۆیان هەیە، بۆیە لە بودجەی جەنگی بە دەرماڵەی ڕێگای سەربازی دروست بکرێت و نۆژەن بکرێتەوە، لە بارەی ڕێگای ناوهاتوو نووسراو لە موشیرەتی ناوهاتوو کراوە و بە گوێرەی ئاماژەکان کارەکە جێبەجێ بکرێت.



BEO.004421.331566.002

| BEO | 004421.331566 | 8 رەمەزان 1334/ 9 تەمموز 1916 |
|---|---|---|

نەزارەتی نافیعە
کارگێری ڕێگا و دەروازەکانی گشتی
بەڕێوەبەرایەتی کاروباری ژمێریاری
ژمارە ٢٤
بۆ جەنابی پاشای جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت
پوختە: بۆ نۆژەنکردنەوەی ڕێگای بەغداد خانەقین دابین کردنی ٥٠٠٠ لیرە، داوای یاساییەك بکرێت یاخود بڕیارێك بدرێت.
ڕاگەیەندراوی بەندەمانە
لەبەر ئەوەی ڕێگای بەغداد-خانەقین ڕێگای گواستنەوەی سەربازی دەوڵەتە، زیاد لە ئاستی خۆیدا گرنگە، بۆ نۆژەنکردنەوە و چاککردنەوەی ئەم ڕێگایەش، دوو تابووری منارەی سەر سنوور بەکارهاتووە، بەڵام خەرجی چاککردنەوەی ڕێگاکە پێویستی بە ٥٠٠٠ لیرەیە، لە تەلەگرافنامەی هاتووی ویلایەتی بەغداد ئاماژەی پێکراوە، ڕێگای ناوهاتوو لە ڕێگا گشتییەکان نییە، بەڵام بۆ نۆژەنکردنەوەی بەپەلەی ڕێگا گشتییەکان بودجەی تەواو دابین کراوە، ئاماژەی پێکراوە، بۆ دابین کردنی ٥٠٠٠ لیرە، بە داواکردنی یاسایەکی تایبەت یاخود بڕیارێکی تر دەبێت، لەم بابەتەدا بڕیار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بەدەستەوەیە.

نازری نافیعە سەر عەسکەر



İ.DH 1519/62 1334.R/21

İ.DH.01519.00062.002

<table>
<tr><td>İ.DH</td><td>01519.00062</td><td>18 ڕەبیعی کۆتایی 1334/ 23 شوبات 1916</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>نەزارەتی ناوەخۆ<br>بەڕێوەبەرایەتی تۆماری ناسنامە و فەرمانبەران<br>ژمارە ٢٥٦٤<br>فەرمانی سەدری ئەعزەم<br>هـەر بـەم مووچەیـەی وەریدەگـرن قائیمقامـی قەزاکانـی خانەقیـن و کازمیـە یوسـف کەنعـان بـەگ و تۆفیـق بـەگ گۆرینەوەیـان پـێ بکرێـت.<br><br>بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی پاشا نازری ناوەخۆ ئەرکی پێ سپێردراوە.<br><br>نازری ناوەخۆ     سەدری ئەعزەم     محەمەد بەگ</td></tr>
</table>



İ.DUİT.00044

| 13 شەوال 1334 /13 ئاب 1916 | 00044.000060 | İ.DUİT |
|---|---|---|
| بابی عالی<br>نەزارەتی ناوەخۆ<br>بەڕێوەبەرایەتی تۆماری ناسنامە و فەرمانبەران<br>١٣٣٦<br>فەرمانی سەدری ئەعزەم<br>ڕەفعەت بەگ قائیمقامی قەزای عەلی ئەلغەربی بەم مووچەی وەریدەگرێت ئەرکەکەی بگوازرێتەوە قائیمقامیەتی خانەقین.<br><br>بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی پاشا نازری ناوەخۆ ئەرکی پێ سپێردراوە.<br>نازری ناوەخۆ سەدری ئەعزەم محەمەد بەگ | | |




İ.DH.01519.00062.001

<table>
<tr><th>İ.DH</th><th>01519.00062</th><th>16 ڕەبیعی کۆتایی 1334/ 21 شوبات 1916</th></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>نەزارەتی ناوەخۆ<br>بەڕێوەبەرایەتی تۆماری ناسنامە و فەرمانبەران<br>ژمارە ۲۰۸۲۲<br>۱۰۸٦<br>جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت<br>ڕاگەیەندراوی بەندەمانە<br>قائیمقامەکانی قەزای خانەقین و کازمیە یوسف کەنعان بەگ و تۆفیق بەگ بەم مووچەی وەریدەگرن گۆڕینەوەیان پێ دەکرێت، لە ویلایەتی بەغداد ئاماژەی پێکراوە، لە ئەنجوومەنی بەڕێوەبەران بڕیار دراوە و لیستی فەرمانی پاشا هاوپێچ پێشکەش کراوە، جێبەجێ کردنی لەسەر پەیوەندیداری سەدارەت وەستاوە، لەم بابەتەدا بڕیار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بە دەستەوەیە.<br>نازری ناوەخۆ</td></tr>
</table>



BEO.004478.335820.001

| 6 شەوال 1335/ 26 تەمموز 1917 | 004478.335820 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
وەڵامی نووسراوی مێژووی ١٩ تەمموز ١٣٣٣ ژمارە ٤٠٤، لە بارەی دامەزراندنی ئەمین بەگ قائیمقامی قەزای بەدرە لە قائیمقامیەتی قەزای خانەقین، بۆ ئەمەش جەنابی پاشا بە فەرمانی پاشا رەزامەندی نیشان داوە، وێنەی پەسەند کراوی هاوپێچ بۆ سەروو بەرز کراوەتەوە.




<table>
<tr><td>BEO</td><td>004477.335735</td><td>24 رەمەزان 1335/ 14 تەمموز 1917</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>وەڵامی نووسراوی مێژووی ٧ تەمموز ١٣٣٣ ژمارە ٣٦٣، رەفعەت بەگ قائیمقامی قەزای خانەقین لە قائیمقامیەتی قەزای سوکە دادەمەزرێت، بۆ ئەمەش جەنابی پاشا بە فەرمانی پاشای رەزامەندی نیشان داوە، وێنەی پەسەند کراوی هاوپێچ بەرز کراوەتەوە.</td></tr>
</table>



| İ.DUİT | 00045.000101 | 5 شەوال 1335/ 25 تەمموز 1917 |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
بەڕێوەبەرایەتی تۆماری ناسنامە و فەرمانبەران
١٠٤٩ تایبەتی
فەرمانی سەدری ئەعزەم
لە مێژووی ١١ تەمموز ١٣٣٣ بەدواوە قائیمقامی قەزای بەدرە ئەمین بەگ لە قائیمقامیەتی خانەقین بە مووچەی خۆی دەگوازرێتەوە و دادەمەزرێت.

بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی پاشا نازری ناوەخۆ ئەرکی پێ سپێردراوە.

سەدری ئەعزەم و نازری ناوەخۆ

BEO.004506.337898.001

| BEO | 004506.337898 | 22 جەمادی یەکەم 1336/ 5 مارت 1918 |
|---|---|---|
| بۆ وەکالەتی نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>وەڵامی نووسراوی مێژووی ٣ مارت ١٣٣٤ ژمارە ٢١٤، سەبارەت بە دامەزراندنی ئەمین بەگ قائیمقامی قەزای خانەقین لە قائیمقامیەتی قەزای گوڵعەنبەر، جەنابی پاشا بە فەرمانی پاشا ڕەزامەندی داوە، وێنەی پەسەند کراوی هاوپێچ بۆ سەروو بەرز کراوەتەوە. | | |

# السيرة الذاتية

## د. نوزاد يحيى سعيد خدر ألياس محمد باجگر

1) ولد في 28 شباط 1948 م.

2) بكر الوالدين يحيى سعيد باجكر و مكيه أحمد صمد سعدالله و لي ثلاث اشقاء وأربعه شقيقات.

3) درست الابتدائية في مدرسة الفيصلية ثم أربيل الاولى .. إبن خلكان. باللغة الكردية و معلمي الاول استاذ ناصح داود و فؤاد معلم الرسم.

4) ثم دراسة المتوسطة في متوسطة أربيل و مدرسي الاول استاذ مكى.

5) ثم اعدادية في اعدادية أربيل ومدرسي الاول الاستاذ خليل عبدالله.

6) دخلت جامعة موصل - كلية طب خريف 1967 .

7) تخرجت طبيباً عاماً 1973-1974 م.

8) تعينت طبيباً مقيماً 1974 - 1975 و رئيس الاطباء المقيمون . يعتبر من أحلى سنوات عمري .

9) شاركت في مؤتمر التأسيس لاتحاد كتاب الاكراد في بغداد 1970 - 1971.

10) التحقت بالخدمة العسكرية اللازمية 1975 - 1976 جندي طبيب. وخدمت في قوات الحدود في زاخو .. أربيل و رواندوز .

11) قضيت طبيب قرى والارياف في كلاله من احلى أيام عمري 1976 - 1977 .

12) طبيب ممارس عام مستوصف سيتاقان .

13) طبيب طواري في مستشفى أربيل الجمهوري.

**14) طبيب متدرب في جراحة الصدر والقلب والاوعية الدموية وفتحت العيادة الخاصة مساءً.**

**15) فتح أول مركز لجراحة الصدر والقلب والاوعية الدموية في كوردستان أربيل مع د. وليد خالد في مستشفى أربيل الجمهوري سنة 1982.**

**16) نقل ملاكي من وزارة الصحة الى وزارة التعليم العالي كلية الطب جامعة صلاح الدين في 1982.**

**17) تنسيب لتدريب جراحة القلب والصدر في مدينة الطب بغداد . تحت رعاية استاذ يوسف النعمان 1983 .. ودراسة الاختصاص في جراحة الصدر والقلب 1983 - 1987 في جامعة بغداد كلية الطب - مدينة الطب الطابق التاسع، سنتان تقويميتان و سنتان دراسة و تدريب.**

**18) منحت لقب طبيب جراح اختصاص بعد إتمام دراستي العليا في مدينةالطب - كلية الطب جامعة بغداد في تشرين الاول 1987 .**

19) رجعت الى أربيل طبيب جراح اختصاص جراح القلب والصدر كلية الطب جامعة صلاح الدين.

20) وجراح اختصاص في مستشفى صدام التعليمي في أربيل 1987 - 1988 .

21) نقلت الى كلية الطب جامعة مستنصرية مستشفى يرموك , فتحت العيادة الخاصة في بغداد. شارع مشجر .. عماده باقر الباقر. 1988 - 1996 .

22) مارست الرسم في شقتي الخاصة في مجمع سولي على البحر المتوسط حيث رسمت 69 لوحة تشكيلية . مرسمي الخاص. و كتبت كثير من الشعر الحر الكردي والعربي .

23) رجعنا 2003 الى الديار في أربيل وتوسع نشاطات الخدمات التجارية والخدمية و التعليمية لكافة مدن كوردستان والعراق.

24) تنشيط الحركة الاقتصادية والاستثمار لكردستان والعراق.

25) إنشاء شركات عالمية في دبي , مرسين , عراق , سريلانكا و انكلترا.

26) تأسيس جامعة جيهان – أربيل 2007 م.

27) تأسيس بنك جيهان للاستثمار 2009 في العراق.

28) تأسيس جيهان للابتدائية والمتوسطة والاعدادية.

29) رئيس مجلس الادارة لشركة جيهان للاعمار.

30) رئيس مجلس الادارة لشركة جيهان للخدمات النفطية.

31) رئيس مجلس الادارة لشركة جيهان للتأمين.

32) تأسيس اذاعة وتلفزيون جيهان 2008 أربيل .

33) تأسيس جامعة جيهان سليمانية 2011 .

34) تأسيس جامعة جيهان في دهوك 2013.

35) تأسيس مركز البحوث والاستشارات العلمية والقانونية للقتل الجماعي.

36) تأسيس نادي جامعة جيهان الرياضي 2010.

37) عضو جمعية جراح القلب العالمي.

38) عضو جمعية جراحي القلب الاسيوية.

39) عضو في نقابات الاطباء . الصحفين وغرف التجارة.

40) مؤسس جمعية الرفق بالحيوان.

41) مؤسس جمعية حماية البيئة.

42) صاحب امتياز مجلة جامعة جيهان .

43) صدر له عشرة كتب هي (أزرع الكلمات , ووشة دةضيَنم , الله, الموت مع الالبوم فن التشكيلي.

44) كتب تحت الطبع و هي: ( السلام )، يقول المعلم، ليلى، الفكر.

45) رئيس مجلس الامناء جامعات جيهان ( أربيل، سليمانية، دهوك ) .

46) من مؤسسي اتحاد مستثمرين كوردستان.

47) من مؤسس سوق الأوراق المالية في أربيل ESX .

48) عضو منظمة السلام العالمي.

49) مشاريع مستقبلية:

أ- مشروع فتح جامعات في الدول الفقيرة. صومال، بنكلاديش وذالك لتواصل الثقافي والعلمي بين الامم.

ب- فتح جامعات في كافة مدن الكبيرة في العراق.

ج-التعليم هو الحل والسلام هو النتيجة.

د- تدريس حقوق الطفل والمرأة في مدارس والجامعات.

هـ- نشر مبدء نبذ العنف الاسرة.المرأة ، الطفل.

و- انشاء مستشفى جيهان التعليمي و لاحقاً فتح كليات الطب والصيدلية, والاسنان والتمريض.

عمري 76 سنة. جراح استشاري، رسام، شاعر، رجل الاعمال ..